یاسەمین موجاهید

# گوڵچنی ئەوین

وەرگێڕانی

ئاراس عیزەدین





یاسەمین موجاهید

# گوڵچنی ئەوین

وەرگێڕانی

ئاراس عیزەدین

بەندی سێیەم: چی دەکەین؟ ........................... ٦٧
بەندی چوارەم: خۆپاراستن چاکترە لە چارەسەکردن ........... ٨٧
بەندی پێنجەم: ڕەچەتەی لەدەستدانی ئازیزێک ............... ٩١
بەندی شەشەم: ڕەچەتەی دڵێکی شکاو ....................... ٩٥
بەندی حەوتەم: پەروەردگار دەتپارێزێت .................... ٩٨
بەندی هەشتەم: کۆتایی ................................ ١٠٠

لە هەرباغێک گوڵێک ..................................... ١٠٣
لەدایکبوونەوە .......................................... ١٠٥
چۆن پەروەردگار بناسین؟ ................................ ١٠٨
گومانی باشبردن بە پەروەردگار ........................... ١١٣
هاوسەرگیری بۆ دۆڕاوەکانە ............................... ١١٥
چیرۆکی ژیانمان ........................................ ١٢٠
گرفتی گەنجیم .......................................... ١٣١
دۆزینەوەی بەهەشت ...................................... ١٣٥
تەمەنێکی پڕ نەهامەتی .................................. ١٣٧
زریانەکە بەڕێوەیە ...................................... ١٣٩
چاوی دڵ ............................................... ١٤١
هەر چرکەیەک لەدایکبوونەوەیەکی نوێیە ..................... ١٤٢
خۆشویستنی کەرەستەکان .................................. ١٤٣
ئیسلام ستەم و دەستدرێژی پەسەند ناکات .................... ١٤٥
ژیان، مردن و دیداری کۆتایمان لەگەڵ پەروەردگاردا .......... ١٤٦
هەمووان ڕزگاربوون ...................................... ١٤٨
بێناونیشان ............................................ ١٥٠
ڕەحمێک بە من بکە ئەی ڕۆح ............................... ١٥٣

لە منداڵێکی سێ ساڵانەوە فێر بووم ........................ ١٥٧
ئیمڕۆ ڕۆژی پاداشت نییە ........................ ١٥٨
ڕزگاربوون ........................ ١٥٩
یادی لەدایکبوونم ........................ ١٦١
داواکردنی پاداشت لە بەرامبەر خەڵاتەکەدا ........................ ١٧٠
نەخۆشی ئایدز: تێڕامان لە خەڵاتەکان ........................ ١٧١
ژیانەوەی دڵە مردووەکان ........................ ١٧٣
ئەی عاشق ........................ ١٧٤
زەلکاو ........................ ١٧٥
مانگی ڕەمەزان: بارینی بارانی ڕەحمەت ........................ ١٧٧
بەردەوامبوون لە هەڵگرتنی مەشخەڵی ڕەمەزان ........................ ١٨١
ژوانبەستن ........................ ١٨٦
ئایا گرووپی میلشیای هوتاری نوێنەری مەسیحییەتن؟ ........................ ١٩١
ئەو وانەیەی لە گوڵەباخێکەوە فێر بووم ........................ ١٩٤
هەوڵدان و ڕووناکیی کۆتایی تونێلەکە ........................ ١٩٨
گرنگی نییەت لە کار و کردەوەدا ........................ ٢٠٢
چاوەکان ........................ ٢٠٣
ڕەگەزپەرستی ........................ ٢٠٨
لەپێناو زێڕدا ئەڵماسەکەت لەدەست مەدە ........................ ٢١٠
ڕێگای نهێنی بەرەو بەختەوەری ........................ ٢١٤
پێنج هەڵەی خێزانی ........................ ٢١٩

تەنـــیاحـــاجی

Tanya Haji | تەنیاحاجی

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایەن خاتوون " یوسڕا عمر "**

**کراوە بە دیاری بۆ خوێنەران**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22



t.me/tanyahaji7

خەڵکی بە جیاواز پێناسەی بەختەوەری دەکەن. دەزانین بەختەوەری ڕاستەقینە بەختەوەری دڵ و ڕۆحە. چۆن دوای نائومێدی بەختەوەری بدۆزینەوە؟ پاشان چۆن بەختەوەری بنیاد بنێین؟

خاتوو یاسەمین موجاهید بەوە ناسراوە کە لەڕێی بۆچوون و تێڕامانە ژیرەکانیەوە سەرنجی تەواوی بینەران و خوێنەرانی ڕادەکێشێت. بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە بەشی دەروونناسی بەدەست هێناوە، پاشان لە زانکۆی ویسکۆنسین مادیسۆن بڕوانامەی ماستەری لە ڕۆژنامەگەری و پەیوەندییەکان بەدەست هێناوە. لە ئێستادا خاتوو یاسەمین موجاهید بانگخوازێکی نێودەوڵەتی و نووسەرە، زۆربەی کارەکانی لەبارەی پەرەپێدانی ڕۆحی و کەسییەوەیە. یاسەمین موجاهید لە ڕێی یەکێک لە پڕفرۆشترین پەرتووکەکانیەوە: «دڵت بێنەوە: تێڕامانی کەسی لەبارەی ڕزگاربوون لە کۆتوبەندەکانی ژیان»ـەوە زیاتر ناسراوە.

# پێشەکی



ژیان کامڵ و بێخەوش نییە. هەندێک جار دەکەوین و شکست دێنین و دەدۆڕێین. چۆن بتوانین لە نائومێدیدا ڕێچکەی ڕزگاربوون بدۆزینەوە و جارێکی دی ژیانێکی بەختەوەرانە و تەندروستانە بژین؟ هەموو شتێک لەم ژینەدا تاقیکردنەوەیە. کاتێک ئەو دووربینانە دەگۆڕین، کە ژیانی خۆمانی لێوە دەبینین، کاردانەوەی ناوەکی و دەرەکیمان بە چەشنێکی سەیر دەگۆڕێت.

بەختەوەری وەدەست دێت، بێ گوێدان بەو دۆخانەی لە ژیاندا پێیدا تێپەڕیوین. هەردەم دەتوانین بگەڕێینەوە لای پەروەردگار بێ گوێدان بەوەی چەندە لە ڕێی ڕاستی لامان داوە. دەتوانین جارێکی دی هەڵسینەوە و لە ڕووی هێز و ئیمانەوە گەشە بکەین.

یاسەمین موجاهید



# بەندی یەکەم

## بەڵێنی پەروەردگار

سبحان الله کاتێک چاوم بە خەڵکی زیاتری سەرانسەری جیهان دەکەوێت، چیرۆکی زیاتر دەبیستم، گوێبیستی ململانێ و نەهامەتی زیاتری خەڵکی دەبم. ئەوەی درکم پێ کردووە، ئەوەیە ئەم ژینە هەمیشە ئاسان و ئاسودە نییە. خەڵکی تووشی زۆر شت دێن، زۆر دەبیستم. فێربووم ئەو شتانەی لەم ژینەدا پێمان دەبەخشرێن دەکرێت سەخت و ناڕەحەت بن.

وەلێ پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا بەڵێنمان دەداتێ: پەروەردگار هیچ تاقیکردنەوە و ئەرکێک ناخاتە سەر شانی مرۆڤەکان کە لە توانایاندا نەبێت.

لە لایەکەوە دەبینین شتانێکی زۆر هەن لە ژیندا بەرگەی دەگرین. هەمووان چیرۆکی خۆیان هەیە، لە هەمان کاتدا پێمان دەوترێت پەروەردگار هەرگیز بارگرانییەک نادات بە سەرماندا کە نەتوانین بەرگەی بگرین.

مانای چییە ئەگەر هەردووکی بخەینە لای یەکەوە؟ واتا بەڵێ، بە دڵنیاییەوە سەختی و ناڕەحەتی هەیە، ململانێ و تاقیکردنەوە هەیە،

لـە هەمـان کاتیـدا بەڵێنـی پەروەردگارمـان هەیـە کـە ئـەو نارەحەتـی و ململانێیانـە بـۆ تێکشـکاندنمان نیـن. پـەروەردگار هەرگیـز ململانـێ و نارەحەتییـەک ناخاتـە سـەر باوەڕدارێـک بـۆ ئـەوەی لەنـاوی ببـات و تێکـی بشـکێنێت، بەڵکـو دەیەوێـت لـەو ڕێیـەوە بەهێزیـان بـکات. زۆر گرنگـە لـەم چەمـک و تێڕوانینـە تێبگەیـن. کاتێـک لـەم تێڕوانینـە تێدەگەیـت، تـەواوی ژیانـت دەگۆڕێـت، هەروەهـا تێڕوانینـی خـۆت بـۆ ململانێـکان دەگۆڕێـت. چـۆن لێکدانـەوە بـۆ ئـەو شـتانە دەکەیـت کـە لـە ژیانتـدا بـۆت دێنـە پێـش؟ چـۆن پێناسـەی پـەروەردگار دەکەیـت لـە ژیانتـدا؟ کاتێک ئەو تێڕوانینانە دەگۆڕێت، ژینیشـت دەگۆڕێت. پێویسـتە بـە دڵ لەمـە تێبگەیـت، نـەک تەنهـا ببیسـتی، یاخـود بیخوێنیتـەوە. مەبەسـتمە بـە تـەواوی ئـەم ڕاسـتییە لـە نـاخ و ڕۆحتـدا جێگیـر بکەیـت، کـە پـەروەردگار هەرگیـز تاقیکردنـەوە و ململانێیەکـت تـووش نـاکات بـە مەبەسـتی لەناوبـردن و تێکشـکانت. پـەروەردگار هەمیشـە لـە زانایـی خۆیـەوە مەبەسـتێکی باشـتر و باڵاتـری هەیـە.

وتمـان لـەم ژیانـەدا ململانـێ و تاقیکردنەوەمـان بـۆ دێتـە پێـش، هەندێکیـان زۆر قـورس و نارەحەتـن. ئەگـەر ئـەو چیـرۆک و بەسـەرهاتانەتان بـۆ بگێڕمـەوە کـە دەیانزانـم، هەموویـان سـەخت و دژوارن. لـە هەمـان کاتـدا پـەروەردگار بەڵێنـی داوە هەرگیـز شـتانێک نەخاتـە سـەر شـانمان، توانـای هەڵگرتنیمـان نەبێـت. پێویسـتە. پێـش ئـەوەی بـاس لـە بەختـەوەری دوای نائومێـدی بکەیـن، تێڕوانینمـان لەبـارەی ململانـێ و سـەختییەکانی ژیانمانـەوە بگۆڕیـن.

## بەندی دووەم



# سەرنج مەخەرە سەر خۆت

یەکێک لە خراپترین و ژەهراویترین شتەکان کە ئەنجامی دەدەین، بریتییە لەوەی ململانێیەک و تاقیکردنەوەیەکی پەروەردگار و ناڕەحەتییەکی ژیانمان وەکو خراپترین شتی پەروەردگار بەدی بکەین و لێکی بدەینەوە. وا گومان بکەین بەهۆی ئەوەوەیە پەروەردگار ڕقی لێمانە و خۆشی ناوێین، یاخود لێمان تووڕەیە. ئەمە هۆکارەکەی ئەوەیە تێڕوانینێکی نەرێنیانەیە لەبارەی پەروەردگارەوە.

ڕەنگە ئێستا بڵێیت چی دەبێت ئەگەر خۆم شایستەی ئەوە بم؟ یاخود هەڵەیەکم ئەنجام دابێت و شایستە بم؟ ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بێت پەروەردگار زۆر لێم تووڕەیە. دەزانیت چی دەڵێم؟ سەرنج مەخەرە سەر خۆت.

وتەیەکی نامۆ و سەیر دیارە. سەرنج دەخەیتە سەر ئەو شتەی ئەنجامت داوە و خراپت کردووە، ڕەنگە ئەوە ڕاست بێت. چی دەبێت ئەگەر ئاڕاستەی سەرنجت گۆڕی و سەرنجت خستە سەر ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار؟ لە کۆتاییدا بەڵێ، هەڵەت کردووە و هەمووان هەڵە دەکەن، ئایا دەزانیت گرفتەکە لە کوێدایە؟ کاتێک هەڵەیەک دەکەین، سەرنج دەخەینە سەر خۆمان، ئەو هەڵەیەی کردوومانە، خاڵی لاوازیمان و هەڵەکانمان. کاتێک سەرنجت

دەخەیتە سەر ئەوە، هەڵەیەکی گەورەتر دەکەیت.

ئایا دەزانیت کێ دەیەوێت سەرنج بخەیتە سەر خاڵی لاوازی خۆت؟ شەیتان. یەکێک لەو هۆکارانەی شەیتان دەیگرێتە بەر بریتییە لەوەی سەرنج و بیر و هۆشت بخەیتە سەر خاڵە لاواز و خراپەکانت. کاتێک شەیتان وات لێ دەکات سەرنجت بخەیتە سەر هەڵە و کەموکورتییەکانت، دەتخاتە نێو نائومێدییەوە.

هەموومان هەڵە دەکەین. ئەگەر کەسێک سەرنج بخاتە سەر هەڵەکانی، لاوازییەکانی و تەنانەت تاوانەکانی، چی ڕوودەدات؟ نائومێد و هیوابڕاو دەبێت. بۆیە ئەمە یەکێکە لە ئامرازەکانی شەیتان و بەردەوام بیرهێنانەوەی ئەو هەڵانەی کردووتن.

من لێرەدا باسی پەشیمانییەکی تەندروست ناکەم. پێویستە لە جیاوازییەکە تێبگەین. باس لەوە ناکەم کە بەڵێ باوەڕدار کاتێک هەڵەیەک دەکات و تاوانێک ئەنجام دەدات، پێویستە هەست بە پەشیمانی بکات. باسی ئەوە دەکەم بەردەوام سەرنجت لەسەریان بێت و دڵ و مێشکت داگیر بکەن. چەشنی ئەوەیە هەڵەیەک بکەیت و بەردەوام تەماشای بکەیتەوە لە خەیاڵ و هزرتدا و بەردەوام بێت. بەردەوام بیرت دەخرێتەوە بەم شێوەیە بوویت و ئەوەت ئەنجام داوە.

ئەو تێڕوانینە نەرێنیانەی بۆ خۆتت هەیە، بەهۆی شەیتانەوەیە. شەیتان دەیەوێت سەرنجت تەنها لەسەر لاوازی خۆت بێت، نەک بەهێزی پەروەردگارت. ئەمەش زۆر جیاوازە. ڕاستییەکە ئەوەیە من لاوازم و پەروەردگار بەهێزە. من هەڵە و کەموکورتیم زۆرە و پەروەردگار کامڵ و بێخەوشە. توانا و دەسەڵاتم سنووردارە، توانا و دەسەڵاتی پەروەردگار بێسنوورە. سەرنجم بخەمە سەر کامیان؟ ئەگەر سەرنجم بخەمە سەر خۆم، سەرنج دەخەمە سەر هەڵە و لاوازی و سنوورداریيەکەم. شەیتانیش ئەمەی دەوێت. بەمەش دەکەوینە نائومێدییەوە.

تەنها بیر لەو شتانە دەکەیتەوە، ئەنجامت داون، ئەو شتانەی لە ڕابردوودا ئازاریان داویت، لەدەستت داون، ئەو شتانەی لە خۆتدا هەن و هەست دەکەیت باش نین و ئەو هەڵانەی کردووتن. ئەم هاوکێشەیەم بینیوە. بەردەوام دووبارە دەبێتەوە. مەبەستی ئەمە بریتییە لە نائومێدکردنت. ئەمە ئامانجی شەیتانە تاکو نائومێدت بکات، بەهۆی بیرهێنانەوەی هەڵەکانتەوە و بەردەوام سەرنج خستنە سەریان. بەم کارە ڕەنگە بیر بکەیتەوە و بڵێیت من چەشنی مسوڵمانێکی باشم، چونکە هەست بە گوناهـ و تاوان دەکەم، هەست بە شەرمەزاری دەکەم، هەڵەم کرد، بەڵام بزانە ئەمە تەنها تەڵەیەک و فریودانی خۆتە. بە زۆر سەرنج خستنە سەر لاوازیی هەڵە و تاوانەکانت، سەرنج خستنە سەر پەروەردگار و ڕەحم و بەزەیی پەروەردگارت لەدەست دەدەیت. ئایا ئەوە ڕوونە؟ ئەوە فریودانێکی شاراوەیە.

چۆن دەتوانین هاوسەنگییەکە بدۆزینەوە؟ پەروەردگار و پەیامبەرمان موحەممەد(ﷺ)، فێریان کردووین هاوسەنگی بپارێزین. مرۆڤین و هەڵە دەکەین، دەخزێین، دەکەوین و خاڵی لاوازیمان هەیە، کاتێک ئەمە ڕوودەدات پێویستە چی بکەین؟

ڕێسایەک هەیە بۆ ئەوەی پێویستە لەو ساتەدا چی بکەین. هەڵەیەک دەکەیت، هەست بە پەشیمانی دەکەیت و ڕاستگۆیانە تۆبە دەکەیت و بەردەوام دەبیت لە ژیان. زۆر سەرنجت مەخەرە سەر هەڵە و تاوانەکانت. ئەگەر تووشی چەقبەستوویی بیت، شەیتان دەیباتەوە. لە هەڵە و تاوانەکانتدا تووشی چەقبەستوویی دەبیت. بۆ کوێ ڕۆیشتی؟ ئەگەر لە هەڵەکانی خۆتدا چەقبەستوو بوویت، بەرەو نائومێدیت دەبات. ئەوەی تووشی نائومێدی و هیوابڕاوی بێت، هەنگاو بۆ نزیکبوونەوە لە پەروەردگار نانێت. نائومێدی توانا و وزەی نزیکبوونەوە لە پەروەردگاری مەزن لەناو دەبات.

## بەندی سێیەم



## هیوا

کاتێک کەسێک دەکەوێتە نائومێدییەوە، تەنانەت هێز و توانای تۆبەکردنی نامێنێت، چونکە لەبارەی خۆیەوە زۆر هەست بە خراپی دەکات و دەیەوێت واز بهێنێت.

تۆبەکردن پێویستی بە هیوا و ئومێدە. هیوا و ئومێد بە لێخۆشبوون و ڕەحمی ئیلاهی. ئەگەر هیوا و ئومێدت نەبوو، هیچ هاندەر و پاڵنەرێکت نابێت بۆ تۆبەکردن. ئەمەش ئەو شتەیە شەیتان دەیەوێت و مەبەستێتی. چەشنی بیرکردنەوەیەکی بەردەوامە، بیرکردنەوە لە هەموو هەڵەیەک کە ئەنجامت داوە، ئازاری داویت و بیرکردنەوە لە هەموو شتێکی ئازاربەخش کە لە ڕابردووتدا ڕوویداوە. بەردەوام دووبارە دەبێتەوە، بۆچی؟ بۆ ئەوەی تێکت بشکێنێت و بتخاتە نائومێدییەوە.

چۆن لەمە ڕزگارت دەبێت؟ یەکەم، پێویستە لەو شتە تێبگەین کە دەبێتە هۆی نائومێدیمان. نائومێدی ڕوودەدات کاتێک سەرنج دەخەیتە سەر خۆت و شتانی دی، نەک پەروەردگار. جا سەرنج خستنە سەر هەڵەکانت، یاخود تاوانەکانی ڕابردووت بێت، دەبێتە

هۆی کەوتنە ناو نائومێدییەوە. گرنگ نییە چەندە تاوان و هەڵەت کردبێت، میهر و ڕەحمی پەروەردگار زۆر لەوە گەورەترە.

تەنانەت ئەگەر هەڵە و تاوانەکانی هەموو مرۆڤەکانی سەر زەوی لە سەرەتای دروستبوونی گەردوونەوە تاکو کۆتایی کۆ بکەیتەوە، هێشتا میهر و ڕەحمی پەروەردگار فراوانترە و زیاترە. پێویستە ئێمە سەرنجمان لەسەر ئەم خاڵە بێت، وەلێ فەرامۆشی دەکەین و بەم شێوەیە دەکەوینە نائومێدییەوە.

کاتێک هەڵەیەک دەکەیت، چارەسەری بکە و هەموو هەوڵی خۆت بدە بۆ چارەکردنی. ناڵێم هیچ گرنگی پێ مەدە و لە ژیان بەردەوام بە. دەڵێم ئەوەی پێویستە ئەنجامی بدە تاکو چارەسەری بکەیت. هەر وەکو لە پەیامبەری نازدارەوە(ﷺ) فێر بووین چەند مەرجێک هەن بۆ ئەوەی تۆبەیەکی نصوح بکەین.

یەکێک لە مەرجەکان بریتییە لەوەی هەست بە پەشیمانی بکەیت، ئەمەش جودایە لە شەرمەزاری و نائومێدی. واتا هەست بە پەشیمانی بکەم، چونکە هەڵەیەکم کردووە، یاخود تاوانێکم ئەنجام داوە. دووەم، واز لە ئەنجامدانی ئەو تاوان و کردەوەیە بهێنیت. سێیەم، نیەتێکی پاک و ڕاستگۆیانەت هەبێت لەوەی نەگەڕێیتەوە سەر ئەو کردەوە خراپە. ئەمانە ئەو کارانەیە پێویستە ئەنجامی بدەیت و بیگریتە بەر. مەرجی چوارەم پەیوەستە بەوەی ئایا ئەو هەڵەیەی ئەنجامت داوە، مافی کێی پێشێل کردووە؟ پاشان هەوڵ بدەیت لەگەڵ ئەو کەسەدا ڕاستی بکەیتەوە و گەردنئازادی لێ بکەیت.

ئەم چوار ڕێگەیە بگرە بەر، پاشان بەردەوام بە لە ژیان و هیوا و ئومێدت هەبێت. هیوا و ئومێدت هەبێت پەروەردگار لێت خۆش بووە. شەیتان دێتە لات و دەڵێت پەروەردگار لێت خۆش نەبووە و هێشتا تووڕەیە لێت. هەر کاتێک سەختی و ناڕەحەتییەک لە ژیاندا

بۆت بێتە پێش، شەیتان وەسوەسەت بۆ دروست دەکات و دەڵێت: بەهۆی ئەو هەڵە و تاوانەوە بووە کە ئەنجامت داوە، پەروەردگار هێشتا تووڕەیە لێت و بەو هۆیەوە سزات دەدات. دەتوانم پێت بڵێم بۆچی ئەم تێڕوانینە هەڵەیە؟

دەمەوێت گومان لە شێوازی بیرکردنەوەت بکەیت. ڕێگەیەکی باوی بیرکردنەوە هەیە زۆر گوێبیستی بووم کاتێک کەسێک تاوانێک، یاخود هەڵەیەکی گەورە دەکات، هەست بە خراپی دەکات و هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ تۆبەکردن و دەستخستنی لێخۆشبوونی ئیلاهی. ڕەنگە داوای لێخۆشبوون لە هەموو ئەو کەسانە بکات کە ئازاری داون، هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ چاککردنەوەی پەیوەندیی لەگەڵ پەروەردگار و کەسانی دیکەدا. دواتر لە ژیانیدا تووشی چەند ململانێ و ناڕەحەتییەک دێت.

ئایا ئەو کەسە چۆن بیر دەکاتەوە؟ شەیتان چی پێ دەڵێت و وەسوەسەی چی بۆ دروست دەکات؟ ئەم ململانێ و ناڕەحەتییە بەهۆی هەڵە و تاوانەکەتەوەیە. ناڕەحەتییەکە بە سزا لێک دەداتەوە. ئایا بۆچی ئەم لێکدانەوەیە هەڵە و نا لۆژیکییە؟ شتێکی گرنگ لەو نێوەندەدا ڕوویداوە، ئەویش تۆبە و پەشیمانییە.

ئەرک و گرنگی تۆبە و پەشیمانی چییە؟ چی دەزانین لەبارەی ئەرک و گرنگی تۆبە و پەشیمانی لە ئایینی ئیسلامدا؟ چی لە تاوان و گوناهەکانمان دەکات؟ دەیانسڕێتەوە. ئەگەر تۆبە و پەشیمانیت کردووە، تاوانەکانت لە نامەی کردەوەکانتدا لای پەروەردگار سڕاونەتەوە. پەروەردگار (التواب)، (العفو)، (الرحمن) و (الرحیم) ـە. پەروەردگار لێبووردە، لێخۆشبوو و بەبەزەییە. تاوانەکانت دەسڕێتەوە.

چۆن دەکرێت ململانێ و سەختییەکە بەهۆی تاوانێکەوە بێت، لە کاتێکدا قەڵەمی لێخۆشبوونی بەسەردا دراوە؟ ئایا ئێستا تێگەیشتیت بۆچی ئەو بۆچوون و لێکدانەوەیە نالۆژیکییە؟ هەموو ئەمانە فێڵ و تەڵەکەی شەیتانن. ئەرک و ڕۆڵی چییە؟ هەر کاتێک دەکەویتە دۆخێکی ناڕەحەتەوە لە ژیاندا، تووشی نائومێدی دەبیت بەهۆی ئەم هەڵە بیرکردنەوەیەوە. لەبری ئەوەی هیوا و ئومێدت بەوە هەبێت پەروەردگار لێت خۆش بووە و هەر ناڕەحەتییەک لە ژیاندا بۆت دێتە پێش بۆ سزادان و تێکشکاندنت نییە، بەڵکوو لەبەر سوود و بەرژەوەندی خۆتە. بە هەر هۆیەک بێت بەهێزت دەکات، خاوێنت دەکاتەوە، فێرت دەکات و ڕێنمویت دەکات، هەمیشە خێر و چاکەی خۆتی تێدایە.

# بەندی چوارەم

## شێوازەکانی بیرکردنەوە

چەندین شێوازی جیاوازی بیرکردنەوە هەن. بیرکردنەوەی نائومێدانە و بیرکردنەوەی گومانباشی بە پەروەردگار «حسن الظن بالله». لە ساتی نارەحەتیدا بوونی گومانی باش بە پەروەردگار شتێکی باشە. «ئەم ململانێ و نارەحەتییەم تووش دەبێت، چونکە پەروەردگار بەهێزم دەکات و ڕەنگە لە شتێکی دی بمپارێزێت.» «ڕەنگە ئەو شتەم دەست نەکەوتبێت کە ویستم لەسەری بووە، نەک لەبەر ئەوەی سزا دەدرێم بەهۆی هەڵە و تاوانێکمەوە کە پێشتر تۆبە و پەشیمانیم دەربڕیوە و تاوانەکەم سڕاوەتەوە، ڕەنگە ئەو شتەم دەست نەکەوتبێت، چونکە پەروەردگار ویستوویەتی لە شتێک بمپارێزێت»، یاخود «ڕەنگە پەروەردگار شتێکی باشتری بۆ ئامادە کردبم».

ئەمانە نموونەی گومانی باشن بە پەروەردگار. بیرکردنەوەیەکی ئەرێنیانەن لەبارەی زاتی مەزنیەوە. گۆڕینی بیرکردنەوەت لە نەرێنییەوە بۆ ئەرێنی و هەمیشەبوونی، لێکدانەوەیەکی ئەرێنیانەیە. تەنانەت کاتێک هیچ بیرۆکەیەکت نییە لەوەی چی شتێکی ئەرێنی بوونی هەیە لەو ڕووداو و بابەتەدا، وەلێ هێشتا ئەرێنیانە بیر دەکەیتەوە.

بیر لە پەیامبەر موسا(ﷺ) بکەرەوە. کاتێک لە نزیک دەریاکەدا وەستا، سوپایەک لە دوایەوە بوو و کەوتبووە نێو تەڵەوە. هیچ ڕێیەکی ڕزگاربوون و دەربازبوونی نەبوو. فیرعەون و داروودەستەکەی لە دوایەوە بوون. فیرعەون درندەترین و زاڵمترین کەسی سەر زەوی بوو. موسا(ﷺ) و قەومەکەی کەوتنە نێو دۆخێکی سەختەوە. بزانە لەو ساتەدا بیرکردنەوەی پەیامبەر موسا(ﷺ) و پاشان قەومەکەی چۆن بوو. بەنی ئیسرائیل بیرکردنەوەیەکی نەرێنیانەیان هەبوو، هەموویان نائومێد بوون.

ئایا هەرگیز بە دۆخێکی لەو چەشنەدا تێپەڕیویت؟ لە دۆخێکدا بیت و بڵێیت: «ملکەچ دەبم و دەست هەڵدەگرم.» «هیچ ڕێیەک بۆ دەربازبوون و ڕزگاربوون نییە.» «بێسوودە.» «ئەستەمە.» «هەرگیز دۆخەکە باشتر نابێت.» یاخود «شتەکان هەرگیز ناگۆڕێن.» ئەمە نائومێدییە. ئایا هیچ کام لەمانە ئاشنان بۆت؟

هەموومان ساتی لاوازیمان هەیە، کاتێک بەم چەشنە بیر دەکەینەوە، هەموومان دەکەوینە نائومێدییەوە. پەیامبەر موسا(ﷺ) لە دۆخێکدا بوو، دەربازبوونی تەواو ئەستەم بوو. بەنی ئیسرائیل بەم چەشنە بیریان کردەوە «تەواو دەستبەسەر کراین.» وەلێ پەیامبەر موسا(ﷺ) بیرکردنەوەیەکی ئەرێنیانەی هەبوو لەبارەی پەروەردگاریەوە و فەرمووی: «نەخێر، لە ڕاستیدا پەروەردگار لەگەڵمدایە و هەر خۆی ڕزگارم دەکات.» بەڵێ، ئەوە بیرکردنەوەی پەیامبەر موسا(ﷺ) بوو.

ئایا دەزانیت ئەم وتەیە چەندە بەهێز و بەپێزە؟ چۆن توانی لەو دۆخە ڕزگاری بێت؟ بڕوات وایە هەرگیز لەوە تێگەیشتبێت چۆن ڕزگاری دەبێت؟ تەماشای باوەڕ و متمانەکەی بکە بە پەروەردگاری مەزن. تەماشای بیرکردنەوە ئەرێنییەکەی بکە و بزانە چی ڕوویدا.

پـەروەردگار لـە ڕێـی شـەقکردنی ئـاوی دەریاکـەوە، ڕزگاریـی پـێ بەخشـی.

پێـش هەمـوو شـتێک پەیامبـەر موسـا(ﷺ) دەبـوو هەندێـک شـت بکات. یەکەم، لـە دڵ و دەروونیـەوە بـاوەڕ و بیرکردنەوەیەکی ئەرێنی هەبوو لەبارەی پەروەردگاریـەوە. تەوەکولی بـە پـەروەردگاری بـوو و هیـچ گومانێک لـە دڵیدا بوونی نەبوو. یەکەمین شت ڕۆحـی و ناوەکی بوو. دووەمین شت، گرتنەبـەری ڕێگەیـەک بـوو.

ئەمـە دووەمیـن شـتە، پێویسـتە ئەنجامـی بدەیـن. ئـەم بەسـەرهاتە تەنهـا بـۆ چێـژ و خۆشـی نییـە، وەلـێ پەنـد و عیبرەتـە بـۆ هەمـووان. کاتێـک لـە دۆخێکـی ئەسـتەمدا خۆمـان دەدۆزینـەوە، پێویسـتە چـی بکەیـن؟ یەکەمین شت پـەروەردگار داوامـان لـێ دەکات، پەیوەسـتە بـە دڵ و دەروون و ناخمانـەوە. نابێت بیرکردنـەوەی نەرێنیمـان لەبـارەی پەروەردگارەوە هەبێت، بەڵکوو تەنهـا بیرکردنـەوەی ئەرێنیمـان هەبێت بـە زاتـی مەزنـی. پـەروەردگار هەمیشـە پلانـی بۆمـان هەیـە و بـۆ خێر و چاکـەی خۆمانـە. پـەروەردگار لـە پشـتمانە.

بەشـی دووەم، کارێکە پێویسـتە لە دیوی دەرەوەدا ئەنجامی بدەین. ئەمەیش بەستنەوەی وشترەکەیە. هەندێک جار پێویستە شتانێک بکەیـن بـۆ گۆڕینـی بارودۆخمـان. دۆخـی ناوەوە و دەرەوەیشـمان هەیە.

کاتێـک لـە دۆخێکـی دژواردایـت و بـەرەو نائومێدیـت دەبـات، کاتێـک بـە خراپـی مامەڵـەت لەگەڵـدا دەکرێـت، جـا لـە ماڵـەوە بێـت، یاخـود لەسـەر کار، کارێکـی ناوەکـی هەیـە پێویسـتە ئەنجامـی بدەیـن، ئەویـش بریتییـە لـە گومانـی باشـبردن بـە پـەروەردگار. مەکـەوە نێو دۆخـی نائومێدییـەوە، مەڵـێ پـەروەردگار جێـی هێشـتووم، یاخـود لێـم توورەیـە، یاخـود بڵێـی: «هیوابـڕاو دەبـم.» هەمیشـە هیـوا و ئومێـدت بـە پـەروەردگارت هەبێـت و گومانـی باشـت پێـی هەبێـت.

بە شێوەیەکی دەرەکیش پێویستە شتانێک ئەنجام بدەیت. پەیامبەرمان موحەممەد(ﷺ)، فێری کردووین «وشترەکەت ببەستەرەوە و پاشان متمانە و تەوەکولت بە پەروەردگار بێت.» جارێکیان پیاوێک وشترەکەی نەبەستبووەوە و پەیامبەری نازدار پرسیاری هۆکارەکەی لێ کرد، ئەویش وەڵامی دایەوە، «چونکە متمانە و تەوەکولم بە پەروەردگارم هەیە.» پاشان پەیامبەر(ﷺ)، ئەم وانەیەی فێر کرد. وشترەکەت ببەستەرەوە و متمانە و تەوەکولت بە پەروەردگار بێت. هەردووکی پێکەوە ئەنجام بدە.

کاتێک لە ناخەوە گومانی باش بە پەروەردگار دەبەین و ڕێککارە ناوەکییەکان ئەنجام دەدەین، ناکەوینە نێو نائومێدییەوە و بە شێوەیەکی نەرێنیانە لێی ناڕوانین. هەروەها پێویستە ئەم کارە ناوەکییە بە کاری دەرەکییەوە پەیوەست بکەین، کە بەستنەوەی وشترەکەیە.

پەیامبەرمان(ﷺ)، فەرمووی: «یارمەتی براکەت بدە ئەگەر ستەمکار بوو، یاخود ستەملێکراو.» یەکێک لە هاوەڵان فەرمووی: «دەزانین چۆن یارمەتی بدەین ئەگەر ستەملێکراو بوو، بەڵام چۆن یارمەتی بدەین، ئەگەر ستەمکار بوو؟» پەیامبەر(ﷺ)، فەرمووی: «لە ڕێی وەستاندن و ڕێگریکردنی لە ئەنجامدانی ستەم.» پێویستە دژی ستەم بوەستینەوە، جا بەرامبەر خۆت، منداڵت، خێزانت، یاخود کەسانی دی لە وڵاتانی دی بکرێت. پێویستە لەوانە بین ستەم لەناو دەبەن. ڕێگە بە ستەم نەدەین و بەرامبەر ستەم بێدەنگ نەبین. پەیامبەر موحەممەد(ﷺ)، فەرمووی: «ئەگەر خراپەیەکتان بینی، هەوڵ بدەن بە دەستەکانی خۆتان بیگۆڕن. ئەگەر نەتانتوانی، بە زمان بیگۆڕن. ئەگەر ئەوەشتان نەتوانی، لە دڵ و دەروونەوە ڕقتان لێی بێت. ئەمەش لاوازترین ئاستی باوەڕ و ئیمانە.» واتە بەشێکی باوەڕ و ئیمانمان بریتییە لە کارکردن دژی نادادپەروەری.

کاتێک پەیامبەر موسا(ﷺ) لەو دۆخەدابوو، لە ناخەوە گومانی باشی بە پەروەردگاری هەبوو، هەروەها دەبوو کاری دەرەکی ئەنجام بدات. پەروەردگار پێی فەرموو: دار عەساکەی هەڵگرێت و بە دەریاکەیدا بکێشێت. ئەویش هەمان کاری ئەنجام دا.

خاڵێکی دی هەیە پێویستە ئاماژەی پێ بدەین، ئەویش «سمیعنا و اطعنا- گوێبست بوون و ملکەچبوونە» هەندێک جار خەڵکی مناقەشەی یاساکان و فەرمایشتەکانی پەروەردگار دەکەن، چونکە وا هەست دەکەن زۆر زیرەک و بەتوانان. «بە ڕای من ئەوە هیچ مانایەکی نییە.» تۆ کێیت؟ لە پەروەردگار زاناتریت؟ لە پەیامبەری نازدار(ﷺ)، باشتر و زیاتر دەزانیت؟ ئەگەر ئەمە شتێکە پرسیاری دەکەیت، چونکە دەتەوێت تێبگەیت، یاخود ڕوونکردنەوەت دەوێت، ئەوە کارێکی باشە. هەمووی پەیوەستە بە ویست و نیەتی خۆتەوە، وەلێ ئێمە باس لەوە ناکەین. باس لە کەسێک دەکەین بەڕاستی مناقەشەی فەرمایشت و فەرمانەکانی ئیلاهی دەکات. ئەمەش جودایە لە پرسین بە مەبەستی تێگەیشتن.

پەیامبەر موسا(ﷺ) پێی وترا دار عەسایەکی گەورە هەڵگرێت و بە دەریاکەی بکێشێت. ڕەنگە کەسێک بڵێت حیکمەت لەم کارەدا چییە؟ بەڵام تەماشای پەیامبەر موسا(ﷺ) بکە، ڕاستەوخۆ ئەو کارە دەکات. گوێی لە فەرمانی ئیلاهی دەبێت و ڕاستەوخۆ ملکەچی دەبێت و بە گوێی دەکات. ئەوە گوێڕایەڵی و ملکەچبوونە. ئەوە مانای بوونە بەندەیەکی گوێڕایەڵی پەروەردگارە.

خەڵکی دەپرسن «بۆچی حیجاب دەپۆشیت؟» ملیۆنان هۆکار هەن بۆ ئەو کارە. خاکیبوون، تاکو خەڵکی بزانن مسوڵمانین و نەتوانن وەکو شمەک لێمان بڕوانن. ئەمانە هەموویان هۆکاری گەورە و گرنگن. تۆ حیجاب دەپۆشیت، چونکە پەروەردگار فەرمانی

کردووە. بڕوا بکە ئەگەر هۆکاری دی بڵێیت، خەڵکانی دی مناقەشەت دەکەن. خاکیبوون لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دی دەگۆڕێت. خاکیبوون پەنجا ساڵ پێش ئێستا جیاواز بووە لە ئیمڕۆ.

"بۆچی بەڕۆژوو دەبیت؟» «بەڕۆژوو دەبم تاکو هەست بە حاڵی هەژاران و نەداران بکەم.» نەخێر، بەڕۆژوو دەبیت، چونکە فەرمانی ئیلاهییە. چونکە کەسێک دێت و دەڵێت: «تەنها لە ڕێی نەخواردنەوەی ئاوەوە، هەست بە حاڵی هەژاران و نەداران دەکەم.» خاڵێکی زۆر گرنگە ئەوەی ئەنجامی دەدەین لەبەر فەرمانی ئیلاهی بێت. ئەوە بەشێکە لە بوونە بەندەی پەروەردگار. گوێبیستی فەرمانی ئیلاهی دەبین و جێبەجێی دەکەین.

پەروەردگار بە پەیامبەر موسا(ﷺ)ی فەرموو و ئەویش ملکەچ بوو. بزانە چی ڕوویدا. پەروەردگار دەریاکەی بە ڕوویاندا کردەوە. لە ئەستەمترین دۆخدا ڕێگای ڕزگاری پێ بەخشین. ئەوە ڕوودەدات کاتێک پەرستشی ناوەکی ئەنجام دەدەیت و متمانە و تەوەکولی تەواوەتیت بە پەروەردگارتە. بیرکردنەوەیەکی ئەرێنیت هەبێت و لە ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار نائومێد نەبیت. هەروەها پەرستشی دەرەکی بریتییە لە گرتنەبەری ڕێککار و کارێک.

ناتوانین بە تەواوی جەخت لەمە بکەینەوە. ماوەیەکی زۆر لە دۆخی خراپ و دژواردا دەمێنینەوە. دادەنیشین و دەترسێین کارێک بکەین و بێدەنگ دەبین. خەڵکیم بینیوە دەیەها ساڵیان لە دۆخی سەخت و دژواردا بەسەر بردووە، تەنها دانیشتوون، چونکە نەیانویستووە کارێک بکەن. دەترسن و ڕێگە بە خۆیان دەدەن بەردەوام بن لەوەی بچەوسێنرێنەوە و بە خراپە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، تەنها لەبەر ئەوەی نایانەوێت هەنگاوێک بنێن و کارێک بکەن بۆ بەرەوپێشبردنی بارودۆخیان.

پێویستە لەو کەسانە بین هەنگاو بەرەوپێش بنێین. کارێکی بوێرانە و جەربەزانە ئەنجام بدەین و متمانەمان بە پەروەردگار بێت. ئەم ڕێسایە ناوەکی و دەرەکییە.

هەندێکجار نائومێدی بەهۆی ئەنجامنەدانی ئەو کارە پێویستانەوەیە کە پێویستن بیانگرینە بەر. ئەنجامنەدانی کاری پێویست دەبێتە هۆی ئەوەی لە ناخی خۆتەوە گومانت لە پەروەردگار و هەموو شتێک هەبێت. وەلێ گرفتەکە لەوەدایە ئەو کارە ئەنجام نادەیت کە گرنگ و پێویستە. ئەوەش دەبێتە هۆی نائومێدی و هیوابڕاوی.

چۆن لەو دۆخەدا ڕزگار بین؟ پێویستە شێوازی بیرکردنەوەت بگۆڕیت لەگەڵ ئەو شێوازەی دەیگریتە بەر.



# بەندی پێنجەم

## بەختەوەری

بەختەوەری چییە؟ چۆن پێناسەی بەختەوەری دەکەیت؟

خەڵکی بە شێوەی جیاواز پێناسەی بەختەوەری دەکەن. دەزانین بەختەوەری ڕاستەقینە بریتییە لە بەختەوەری دڵان. مەرج نییە بەختەوەری چێژی جەستەیی بێت. کەسانێک هەن سەروەت و سامانی زۆریان هەیە، هێز و دەسەڵاتی زۆریان هەیە، وەلێ هێشتا خەمبارن و لە ژیانیاندا بەختەوەری بەدی ناکەن.

کەسانی ناودار و بەناوبانگ هەبوون خۆکوژییان کردووە یاخود بەهۆی زۆر بەکارهێنانی دەرمانەوە مردوون، چونکە بەختەوەری پەیوەست نییە بەوەی چەندە پارە لە ئەژماری بانکیتدا هەیە. بەختەوەری هەستێکی ناوەکییە.

چۆن دوای نائومێدی و هیوابڕاوی، بەختەوەری ناوەکی بدۆزینەوە؟ زۆر گرنگە تێبگەین بۆچی نائومێدی ڕوودەدات؟ دواتر بزانین چۆن بەختەوەری دروست بکەین؟

بەختەوەری یەکگرتنی دوو شتە: یەکەم، شێوازی بیرکردنەوە. دووەم، شێوازی مامەڵەکردن و کارکردن.

دەروونناسان بۆیان دەرکەوتووە مرۆڤ بە جۆرێک لە بەختەوەریی فیترییەوە لەدایک دەبن، واتا لەو خاڵەوە بەردەوام دەبێت، بەختەوەری بۆماوەییە. بۆ هەندێک کەس ئەم ڕێژەی بەختەوەرییە زۆرە و بۆ هەندێکی دی کەم. لەگەڵ ئەوەشدا دەروونناسان دەڵێن تەنها ٤٠٪ی بەختەوەری مرۆڤ پەیوەستە بەم خاڵی بنەڕەتەوە. بە واتایەکی دی دەتوانین بڵێین: «بەم چەشنەین کە هەین.» هەواڵە خۆشەکەی پەیوەستە بە نیوەکەی دی بەختەوەرییەوە ئەوەیە تەواو لەژێر دەسەڵاتی خۆتدایە. لە کۆتاییدا دەروونناسان دەڵێن نزیکەی ٤٠٪ی بەختەوەری پەیوەستە بەو خاڵە بنەڕەتەی وەکو بۆماوەیی بەدەستی دەهێنیت. ١٠٪ی پەیوەستە بە پێداویستییە سەرەکییەکانی ژیان و ٥٠٪ی بە تەواوی پەیوەستە بە دەسەڵات و ویستی خۆتەوە.

لەو ٥٠٪یەی بەختەوەری، پەیوەستە بە چۆنیەتی بیرکردنەوە و ڕەفتار و کارکردنتەوە. نەک تەنها پەیوەست بێت بەو شتانەی لە ژیانتدا ڕوودەدەن، بەڵکوو پەیوەستە بەوەی چۆن کاردانەوەت بۆ شتەکان دەبێت. واتا بەندە بەوەی چۆن کەسێک بیر دەکاتەوە و ڕەفتار دەکات.

چۆن شێوازی بیرکردنەوەمان بگۆڕین تاکو بەختەوەریمان زیاد بکەین؟ ئەمەش بوارێکە دەروونناسان لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن. توێژینەوەیەکی زۆریان ئەنجام داوە لەسەر بیرکردنەوە و چۆنیەتی کاریگەریکردنە سەر بەختەوەریمان. یەکێک لەو شتانەی بۆیان دەرکەوتووە بریتییە لەوەی خەڵکی شتێکیان هەیە پێی دەوترێت شێوازی زیهنی بیرکردنەوە. ئەو شێواز و ڕێگایانەی جیهانی پێ لێک دەدەیتەوە، بیر لەو شتانە دەکەیتەوە لە جیهاندا ڕوودەدەن و پێناسەی دەکەیت.

ئـەوەی دەروونناسـان بۆیـان دەرکەوتـووە ئەوەیـە شـێوازی بیرکردنـەوەی ئەرێنیانـە و نەرێنیانـە هـەن. یەکێـک لـە نەرێنیتریـن شـێوازی بیرکردنـەوە، بریتییـە لـە ناوەکـی جێگیـری گشـتگیر.

## ناوەکی

کاتێک شتێکی نەرێنیانە ڕوودەدات، چۆن لێکدانـەوەی بۆ دەکەیت؟ ئەگـەر کەسـێک شـێوازی بیرکردنـەوەی ناوەکـی جێگیـری گشـتگیری هەبێت، ئـەو شتە خراپە دەکاتـە ناوەکی و بەشێک لـە خۆی. دەڵێت: «بەهـۆی منـەوە بـووە.» «هەڵـەی مـن بـوو.» «لەبـەر ئەوەیـە مـن کەسـێکی خراپم.» «من زۆر باش نیم.» هـەر شـتێکی خراپ ڕوودات دەیکاتـە بەشـێک لـە خـۆی و سـەرزەنشتی خـۆی دەکات. لۆمەکردنـی خـۆت. ئەمـە شـێوازێکی بیرکردنەوەیـە.

کەسـی خـاوەن بیرکردنـەوەی دەرەکـی جێگیـری گشـتگیر دەڵێت: «ئـەوە لـە دەرەوەی دەسـەڵاتی منـە.» لۆمـە و سـەرزەنشـتی خـۆی نـاکات و ڕەنگـە بڵێـت بەهـۆی بارودۆخەکەوەیـە.

## جێگیر

کاتێک شتێکی خراپ ڕوودەدات، چۆن بیر دەکەیتـەوە؟ ئایا وا بیر دەکەیتـەوە هەمیشـە خـراپ دەبێت، یاخود ئـەوە کاتییە؟ ئـەوە جیاوازی نێوان شێوازی بیرکردنـەوەی جێگیر و ناجێگیرە.

کاتێک بیر دەکەیتـەوە دۆخەکە هەمیشـە بـە خراپی دەمێنێتـەوە، ئـەوە بیرکردنەوەیەکی خـراپ و ژەهراوییە. چی شتێک سـەرنجڕاکێشـە لـەم شێوازی بیرکردنەوەیـەدا؟ ئەوەیە کاتێک بیرکردنەوەی پەیامبەری نـازدار(ﷺ)، دەخوێنیتـەوە. یەکێک لـە نزاکان زۆر دڵگیرە لام، چونکە بڕوام وایـە پوختـەی بیرکردنـەوەی بـاوەڕداران دەردەخـات، ئەویش

نزاکەی پەیامبەر ئەیوبە(ﷺ).

پەیامبەر ئەیووب(ﷺ) تووشی ناڕەحەتی لە دوای ناڕەحەتی بوو. تووشی نەخۆشی بوو، سەروەت و سامانەکەی و خێزانەکەی لەدەست دا. دوای چەندین ساڵ لەم ناڕەحەتی و نەهامەتیانە بەم شێوازی نزایە هانای بۆ پەروەردگار برد: تووشی ناڕەحەتی و نەهامەتی بووم، تۆیش بەخشندەترین و میهرەبانترینی.

ئەم بەشەی نزاکە بۆ زانینی ناڕەحەتییەکەیە. دەبینیت پەیامبەر ئەیووب(ﷺ) لە بەردەم پەروەردگاردا هیچ خۆی نەنواند. هەندێک جار هەوڵ دەدەین لە ڕێی کپکردن و سڕکردنی هەستەکانمانەوە، بەهێز بین. نامانەوێت هەست بە ئازار بکەین، بۆیە وا خۆمان دەردەخەین هەموو شتێک باش بێت. پەیامبەر ئەیووب(ﷺ) وا خۆی دەرنەخست، وەلێ بە پەروەردگاری فەرموو ئەو دۆخەی تێیدایە گەلێک سەخت و دژوارە.

ئێستا با سەرنج لە بەشی دووەمی نزاکەی پەیامبەر ئەیووب(ﷺ) بدەین. ئەوەی جێی سەرنجە لەو ساتەی نزاکەی تێدا کرد لە ناوەڕاستی نەهامەتی و ناڕەحەتییەکەدا بوو، وەلێ هێشتا هیوا و ئومێد لەدەست نادات. تێدەگەیت چی ئەنجام دا؟ ئەو متمانە و تەوەکولی بە پەروەردگاری هەبوو، هەستی بە ناڕەحەتییەکەی دەکرد و لە هەمان ساتدا تووشی نائومێدی نەبوو.

پەیامبەر ئەیووب(ﷺ) نافەرموێت: «دۆخم هەمیشە خراپ دەبێت و دەست هەڵدەگرم.» ئەو هێشتا هیوا و ئومێدی بە ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار هەیە. ئەوە دۆخی باوەڕدار و کاردانەوەی باوەڕدارە لە ساتی ناڕەحەتیدا. درککردنە بەوەی هەرچەند ئێستاکە لە تاریکی و تەنگانەدان، هەتاوەکە جارێکی دیکە دەدرەوشێتەوە. کەسێک بە نەرێنی بیر بکاتەوە دەڵێت ئێستاکە تاریک و تەنگە و هەمیشە بەو چەشنە دەمێنێتەوە. هەتاوەکە جارێکی دیکە بەرز نابێتەوە و نادرەوشێتەوە.

نییە. کەسێک بیرکردنەوەی نەرێنی هەبێت، وا دەزانێت هەموو شتەکان خراپن.

لە قورئانی پیرۆزدا ڕێسایەک هەیە «لەگەڵ هەموو نارەحەتییەکدا، ئاسانی و ئاسوودەیی دێت.» لە هەر دۆخێکدا بیت هەموو شتەکان خراپ نین. لەگەڵ یەک نارەحەتیدا پەروەردگار چەندین ئاسانکاریت پێ دەبەخشێت، لە هەمان کاتدا نەک دوای نارەحەتییەکە.

شێوازی بیرکردنەوەمان شێوازی کاردانەوەمان دەگۆڕێت. ئەوەی دەروونناسان بۆیان ئاشکرا بوو بریتییە لەوەی شێوازی بیرکردنەوەی ناوەکی جێگیری گشتگیر پەیوەندی بە خەمۆکی و نیگەرانییەوە هەیە. ئەوانە ئەگەری زیاتریان هەیە بکەونە خەمۆکی و نیگەرانییەوە. سبحان الله، ئەوە شێوازی بیرکردنەوەمانە. گۆڕینی شێوازی بیرکردنەوەمان، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر گۆڕینی کاردانەوەمان و باری هەست و سۆزمان هەیە.



# بەندی شەشەم

## میوانێکت هەیە

چی شتێکی دیکەمان بۆ ئاشکرا بوو لەبارەی گۆڕینی شێوازی بیرکردنەوەمانەوە، کە پەیوەندی هەبێت بە بەختەوەرییەوە؟ چەند خوویەکی زیهنی دیاریکراو هەن دەبنە هۆی لەناوبردنی بەختەوەریمان. یەکێک لەو خووانە بریتییە لە دروستکردن و بانگهێشتکردن و هەستکردن بە بیرکردنەوەی نەرێنی.

هەموو ساتێک چەندین بیرکردنەوەی جیاواز هەن لە دەرگای مێشکمان دەدەن. دەمەوێت چەشنی میوانێک لەم بیرکردنەوانە بڕوانیت کە لە بەردەم دەرگاکەت وەستابێت و لە دەرگا بدات. وا دابنێ کەسێک لە دەرگای ماڵەکەت دەدات، لە کونی دەرگاکەوە تەماشا دەکەیت و دەبینیت دراوسێکەتە هەندێک خواردن و گوڵی بە دەستەوەیە. ئایا دەرگاکەی بە ڕوودا دەکەیتەوە یاخود نا؟ ئەگەری زۆرە دەرگاکەی لێ بکەیتەوە.

ئەی چی دەبێت گوێت لە تەقەی دەرگاکە بێت، تەماشا بکەیت و ببینیت پیاوێکە بە تفەنگێک، یاخود چەقۆیەکەوە وەستاوە، ئایا دەرگاکە بە ڕوویدا دەکەیتەوە، یاخود نا؟ هیواداریـن دەرگاکە نەکەیتەوە.

زۆرێکمان چی دەکەین؟ دەبینین پیاوێک بە تفەنگ، یاخود چەقۆیەکەوە لە بەردەم دەرگایماڵەکەماندا وەستاوە، دەرگاکەی لێ دەکەینەوە و دەڵێین: «فەرموو وەرە ژورەوە. چایەک بخۆرەوە و هەندێک گۆشتی برژاو بخۆ».

ئەم کارە دەکەین لەگەڵ بیرکردنەوە نەرێنییەکانمان. بیرکردنەوەی نەرێنی هاوشێوەی ئەو پیاوەن کە لە بەردەم دەرگاکەدا وەستاوە و چەکێک بە دەستیەوەیەتی. ئەو دەیەوێت ئازارمان بدات. لەوێ نییە بۆ ئەوەی گوڵ، خواردن، یاخود مژدەیەکی خۆشت بداتێ. لەوێیە تاکو ماڵەکەت وێران بکات و لەناوت ببات. ئێمەش مۆڵەتی تەواوی دەدەینێ بێتە ژوورەوە.

کاتێک بیرکردنەوەیەکی نەرێنیت هەیە و لە دەرگای مێشکت دەدات. چی دەکەیت؟ ئایا دەرگای بۆ دەکەیتەوە؟ یاخود بە داخراوی دەیهێڵیتەوە؟ کاتێک بیرکردنەوەیەکی نەرێنیت هەیە لە دەرگای مێشکت دەدات، بۆ نموونە قسەکردنی نەرێنیانە لەبارەی خۆتەوە، چی دەکەین لەبارەی ئەم بیرکردنەوانەوە؟ دەهێڵین بێنە مێشکمانەوە، خواردن و شوێنی مانەوەیان بۆ دابین دەکەین.

کاتێک بیرکردنەوەیەکی نەرێنیت هەیە لە دەرگای مێشکت دەدات، ڕەنگە شتێکی نەرێنی بێت لەبارەی کەسێکی دیکەوە، چی دەکەیت؟ ئایا ڕێگری لێ دەکەیت؟ یاخود دەهێڵیت بێتە ژوورەوە؟ دەهێڵیت بێتە ژوورەوە و خواردنی دەدەیتێ. پێشبینی بکە دواتر چی ڕوودەدات؟ گەشە دەکات. دێوەزمەکان کاتێک خواردنیان دەدەیتێ، گەشە دەکەن. ترس بیرکردنەوەیەکی دیکەی نەرێنیانەیە لە دەرگای مێشکمان دەدات. زۆر لەم بیرکردنەوەیەمان هەیە. چی دەبێت ئەگەر ئەمە و ئەوە ڕووبدەن؟ سەرەتا ترسەکە دێوەزمەیەکی بچووکە. پاشان خواردنی دەدەیتێ و دەبێتە دێوەزمەیەکی گەورە. بیر لە

هەموو ئەو شتە ترسناکانە دەکەیتەوە کە ڕەنگە ڕووبدەن.

بۆ نموونە، نیگەرانییەکان. ئەو شتانەی لێیان دەترسین. سیناریۆی «چی دەبێت ئەگەر...» چی دەبێت ئەگەر ئەمە و ئەوە ڕووبدات؟ پاشان لە مێشکی خۆماندا جێی دێڵین وەکو ئەوەی پێشتر ڕووی دابێت. لێدانی دڵت زیاد دەکات، هەناسەدانت دەگۆڕێت، جەستەت کاردانەوەی بیرکردنەوەتە. ئەمە وەکو ڕێدانی دزێکە بێتە ژوورەوە بە تفەنگەوە و ماڵەکەت وێران بکات.

بەم چەشنە خۆمان لەناو دەبەین. ئاگادار نین لەبارەی ئەوەی ڕێگەمان بە کێ داوە بێتە پەناگەی مێشکمانەوە. مێشک و دڵت پەناگەن چەشنی ماڵەکەت. ناهێڵیت هەموو کەسێک بێتە ناویەوە.

دەمەوێت درک بەوە بکەیت دەسەڵاتت بەسەر بیرکردنەوەتدا هەیە. ڕاستە ناتوانیت دیاری بکەیت کێ لە دەرگاکەت بدات، وەلێ دەسەڵاتت هەیە بەسەر ئەوەی دەرگا بە ڕووی کێدا دەکەیتەوە.

پرسیارێک ڕەنگە کەسێک بپرسێت پێویستە چی بکەم ئەگەر شتێک هەبوو لێی بترسێم؟ ئەوە شتێکی سروشتییە بترسین. شتێکی سرووشتی و ئاساییە شتانێک هەبن لێی بترسین. چی بکەم ئەگەر ترس لەبەردەم دەرگاکەمدا بوو؟ کام ڕێگە گونجاوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیدا؟

ئەو ڕێسا باش و گونجاوەی بۆم ئاشکرا بووە کاتێک دەترسین بریتییە لە: نزای ئەو شتە بکە لێی دەترسیت. دەرگاکە مەکەرەوە. دەرگاکە دابخە. مەهێڵە چەتەکە بەم هەموو چەک و تفەنگەوە، بێتە ژوورەوە، لەبری ئەوە دەرگاکە دابخە و نزاکەت بکە.

کەواتە یەکەمین هەنگاو بریتییە لەوەی نزا بکەیت لەو شتەی لێی دەترسیت. دەترسیت ئەوە ڕووبدات، نزا بکە «ئەی پەروەردگار، بمپارێزە لەم شتەی ڕوودەدات.» «پەروەردگارم، بمپارێزە لە

ڕوودانی ئەم شتە.» هەندێک جار ڕەنگە ئەو ترسە خرابێتە دڵتەوە تاکو هانت بدات ئەو نزایە بکەیت و بەهۆی ئەو نزایەوە پارێزراو بیت. کەواتە چەشنێک لە پاراستنی خۆتە.

هەنگاوی دووەم بریتییە لەوەی لە خۆت بپرسیت: ئایا هیچ ڕێککار و کارێک هەیە بیگرمە بەر، یاخود پێویست بێت ئەنجامی بدەم، تاکو خۆم و کەسانی دی لەو ترسە بپارێزم؟ ئەگەر وەڵامەکە بەڵێ بێت و ئەو کارە حەڵاڵ و ڕێپێدراو بێت، ئەوا ئەنجامی بدە.

دوای ئەوەی هەردوو هەنگاوەکەت گرتە بەر. دەرگاکە مەکەرەوە. ڕاستە دواتر و جارێکی دی لە دەرگا دەداتەوە، وەلێ تۆیش هەمان ئەو هەنگاوانە بگرەوە بەر.

دەزانیت چی بەسەر ئەو ترسەدا دێت؟ ترس پێشتر ئامرازێک بوو شەیتان دژی تۆ بەکاری دەهێنا. یەکێک لە ئامرازەکانی شەیتان بریتییە لە هێشتنەوەت لە نائومێدی و ترسدا، چونکە وەکو زنجیرێک وان بە ملمانەوە، ناهێڵن لە پەروەردگار نزیک ببینەوە و ژیانێکی شایستەتر بژین. ئەگەر ئەم دوو هەنگاوە بگرینە بەر، ترس دەبێتە ئامرازێک بۆ نزیکبوونەوە لە پەروەردگار. کاتێک لە شتێک دەترسیت، ئەو نزایە دەکەیت و داوای یارمەتی لە پەروەردگار دەکەیت. ئەگەر دەرگاکە بکەیتەوە و خواردن بدەیتە ترس، ترسەکە دەبێتە شتێک و لەناوت دەبات، پاشان شەیتان دژت بەکاری دێنێتەوە، چونکە ئەوە خاڵی لاوازی تۆیە.



# بەندی حەوتەم

## بەئاگابوون

یەکێک لەو شتانەی لە ڕێیەوە دەتوانیت گومانباشی بە پەروەردگار دروست بکەیت، بریتییە لە شوێنگرتنەوەی بیرکردنەوە نەرێنییەکان بە بیرکردنەوە ئەرێنییەکان. ئەی چی لەبارەی شێوازی ڕەفتار و کاردانەوەمان؟ دەتوانین چی شتانێک بکەین لە ڕەفتارەکانماندا تاکو بەختەوەریمان زیاد بکەین؟

کاتێک سەرنج لە توێژینەوەی دەروونناسان دەدەیت لەبارەی بەختەوەرییەوە ئەنجام دراون، چەند شتێکی گرنگیان دۆزییەوە کار دەکەنە سەر بەختەوەری. یەکێک لەوانە بریتییە لە بەئاگابوون. بەئاگابوون وەک ئامادەگی لێک دەدەنەوە و ڕوونی دەکەنەوە. بۆچی ئەمە جێی سەرنجە؟ بۆ نموونە کاتێک بیر لە زیکرەکان، یاخود خشوع لە نوێژەکاندا دەکەیتەوە، ئەوە بەئاگابوونە. واتا ئامادەگی و هەستکردن بە نزیکی پەروەردگار نەک بیرکردنەوە لە شتانێکی دی.

خشوع چییە؟ کاتێک نوێژ دەکەیت، خشوع واتە ئامادەگی و سەرنجدانت لەسەر نوێژەکەت، نەک بیرکردنەوە لەوەی سبەی بۆ کوێ بڕۆیت، ئەو چێشتەی لەسەر ئاگرەکە داتناوە، یاخود ئەوەی

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بڵاوت کردۆتەوە. ئەو ئامادەگییە بریتییە لە بەئاگابوون. بەڵام جۆرێکی باڵاتری ئامادەگییە، چونکە نەک تەنها ئامادەی خواردنیت، بەڵکوو ئامادەی لەگەڵ پەروەردگارتدا. بەم چەشنە کاریگەری ئەمە زۆر زیاتر دەبێت. لە توێژینەوەکانیاندا بۆیان دەرکەوت ئامادەبوونت لە هەموو شتێکدا بەختەوەریت زیاد ناکات. ئێستا خەیاڵبکە لەگەڵ پەروەردگار و زیکر و یادی پەروەردگاردایت، ئاگادار و بەئاگایت لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا، ئەوە چەندە بەپیز و مانابەخش دەبێت؟ دەکرێت ئاگاداری هەناسەدانت بیت و بەختەوەریت زیاد بکات.



# بەندی هەشتەم

## سوپاسگوزاری

ئایا چی دیکەیان لە توێژینەوەکاندا دۆزیوەتەوە؟ بۆیان دەرکەوتووە سوپاسگوزاری کاریگەرییەکی زۆر بەهێزی هەیە لەسەر زیادکردنی بەختەوەری.
لە ڕاستیدا توێژینەوە هەیە دەری دەخات بوونی لیستێکی سێ بۆ پێنج شت کە ڕۆژانە سوپاسگوزاری بۆیان ڕێگایەکی کاریگەرە بۆ زیادکردنی بەختەوەری، تەنانەت چارەسەرکەری خەمۆکی و نیشانەکانی خەمۆکییە. بۆچی بەم شێوەیە؟ چونکە دەبێتە هۆی گۆڕینی سەرنجت لەسەر ئەو شتانەی نیتە بۆ ئەو شتانەی هەتە. سەرنجت لەسەر هەر شتێک بێت، زیاد دەکات و گەشە دەسەنێت.
پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ڕێسایەکمان لەبارەی سوپاسگوزارییەوە فێر دەکات. پێمان دەفەرموێت ئەگەر سوپاسگوزار بین، بەخشش و نیعمەتەکانمان زیاد دەکات. ئەگەر دەتەوێت بەخششەکانت زیاد بکەن، سوپاسگوزاربە بۆ ئەو شتانەی هەتە. ئەوە ڕێسایەکی گرنگە. ئەم ڕێسایە کار لەسەر خەڵکیش دەکات. کاریگەرترین ڕێگا بۆ دەسکەوتنی شتێک لە کەسێک بریتییە

لـە دەربڕینـی سوپاسـگوزاری بـۆ ئـەو کارەی ئەنجامـی داوە. ئەگـەر سوپاسـی کەسـێک نەکەیـت و شـتەکە بـە موڵکـی خـۆت بزانیـت، خێراتریـن ڕێگەیـە بـۆ لەدەسـتدانی ئـەو کەسـە. هەروەهـا خێراتریـن ڕێگەیـە بـۆ سـاردکردنەوەی کەسـێک لـە ئەنجامدانـی کار و چاکەیـەک بـۆت.

کاتێک سوپاسگوزاریت بۆ ئەو خەڵات و نیعمەتانەی پەروەردگار پێـی بەخشـیویت، پـەروەردگار ئـەو خەڵاتانـەت بـۆ دەپارێزێـت و زیاتریـان دەکات.

کاتێک باس لە شێوازی بیرکردنەوەمان دەکەین، سـەرنجمان زۆرە. ئەمـەش پەیوەسـتە بە چەمکی سوپاسـگوزارییەوە. وێنەیـەک هەیە دوو منداڵ پێشـان دەدات. لـە بەشـی سـەرەوەی وێنەکە منداڵێکی بچووک هەیـە پارچـە کێکـی هەڵگرتـووە و لـە خۆشـیدا خەنـدەی کـردووە. لـە بەشـی خـوارەوەی وێنەکـەدا منداڵێکی تـر هەیـە کێکێکـی گـەورەی بـە دەسـتەوەیە، وەلێ پارچەیەکی بچووکی لێ کراوەتـەوە. بۆیـە منداڵەکە هەسـت بـە دڵتەنگـی و خەمبـاری دەکات. بۆچـی منداڵـی یەکەمیـان بەختـەوەر و دڵخۆشـە، وەلـێ منداڵەکـەی دی دڵتەنگـە؟ بـە کورتـی و پوختـی ئـەو منداڵـەی دڵخۆشـە کێکـی کەمتـری پێیـە، بـەڵام سـەرنجی لەسـەر ئەوەیـە کـە هەیەتـی، بۆیـە بـە کەیـف و گوشـادە. بـە پێچەوانـەوە منداڵەکـەی دی سـەرنجی لەسـەر ئـەو شـتەیە کـە دیـار نییـە، بۆیـە دڵتەنگ و خەمبارە. کاتێک سـەرنج دەخەیتـە سـەر بەخششـەکان، زیاد دەکـەن و هەسـت بـە دەوڵەمەنـدی و شـادی دەکەیـت. کاتێـک سـەرنج دەخەیتـە سـەر ئـەو شـتەی لـە ژیانتـدا بوونـی نییـە، ئـەو شـتانەی نیتـە زۆر دەبن. هەسـت دەکەیـت هەژاریـت. ڕەنگـە زۆریشـت هەبێـت، وەلێ هێشـتا لـە ناخـەوە هەسـت بـە هـەژاری و نـەداری دەکەیـت.



## بەندی نۆیەم

# چارەسەرکەری گرفتان

گرفتێکی دیکە هەیە کاتێک دێتە سەر سەرنجدان لە کێشە و گرفتەکانت. کەسانێک هەن لە هەر دۆخێکدا بێت سەرنج دەخەنە سەر گرفتەکە. لە هەر دۆخێکدا بێت سەرنج دەدەن «گرفتەکە چییە؟» بۆ مەبەستی خراپ نییە. بۆچی؟ چونکە چارەسەرکەری گرفتانم.

کاتێک چارەسەرکەری گرفتانی، ئەوە سروشت و تایبەتمەندی خۆتە. کەواتە هەمیشە سەرنجت لەسەر چی دەبێت؟ گرفتەکان.

کەسانێک هەن خاڵی بەهێزییان بریتییە لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفت. ماشاء اللە، بەڵام ئەوە بەردەوام نیگەران و پەرێشانیان دەکات، بۆچی؟ چونکە هەمیشە کێشە و گرفت هەن لە هەموو شوێنێکدا. هیچ کاتێک بێ کێشە و گرفت نابێت. بۆیە ئەوەی بەردەوام سەرنجی لەسەر کێشە و گرفتەکانە، هەمیشە نیگەران و پەرێشانن. بەئاگابوون لە یاد بکە. هەمیشە سەرنج و بیرت لەسەر گرفتەکانە. تاکە شتێک بگۆڕێت بریتییە لە گۆڕانی کێشە و گرفتەکە. شێوازی گرفتەکە دەگۆڕێت، وەلێ هەردەم گرفت هەیە سەرنج و فکری خۆتی پێوە سەرقاڵ بکەیت، چونکە سەرنجت لەسەر گرفتەکانە، ئەوە شێوازی بیرکردنەوەی تۆیە.

پەرتووکێک هەیە بە ناونیشانی «پیاوان لە مەریخەوە هاتوون، ئافرەتانیش لە ڤینۆسەوە.» بەپێی ئەم پەرتووکە کاتێک ئافرەتێک سکاڵا لەبارەی گرفتەکانیەوە دەکات، مەبەستی لەوەیە هاوسۆزی و هاوخەمی بۆ دەربڕێت نەک چارەسەری بۆ بدۆزیتەوە. پاشان پیاوەکە کڵاوی مستەر فیکس ئیت دەپۆشێت و چارەسەری خۆی دەخاتە ڕوو.

ئێمەیش چەشنی ئافرەتان ئەوە دەکەین. دەمانەوێت گرفتەکان چارەسەر بکەین. لە کۆتاییدا تەواوی بیرکردنەوە و ژیانمان بە هەڵگرتنی ئەم گرفتەوە بەسەر دەبەین، پاشان ڕزگاربوون لێی نارەحەت و سەخت دەبێت. سەختە بخەویت و پشوو بدەیت. بەردەوام گرفتەکە لە هزر و خەیاڵتدا دێت و دەچێت. پاشان هەوڵ دەدەین چارەسەر بدۆزینەوە. گرفتەکە لێرەدایە زۆر خۆت پەرێشان و شەکەت و ماندوو دەکەیت، هیچ چارەسەرێک دەستناکەوێت. چارەسەر بە خەیاڵی من و تۆدا نایەت. ڕاستە پێویستە هەوڵی خۆمان بدەین، وەلێ کاتێک پشت بە خۆمان دەبەستین بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکە، گرفتەکە چارەسەر نابێت.

لا حول ولا قوة إلا بالله. ئەوە حەقیقەتەکەیە. هیچ شتێک ناگۆڕێت و هیچ هێز و دەسەڵاتێک نییە جگە لە زاتی مەزنی پەروەردگار. ئایا دەزانیت ئەوە مانای چییە؟ مانای ئەوەیە گرفتەکە چارەسەر ناکەیت. پەروەردگار چارەسەری دەکات. پشت بە خۆت مەبەستە لە چارەسەرکردنی هەموو گرفتێکدا. گرفتەکە لەوەدایە نەک ئەوەی تەنها چارەسەری گرفتی خۆت بکەیت، وەلێ ویستت هەیە چارەسەری گرفتی هەمووان بکەیت. چۆن ئەم هەموو فشار و پەستانە دەخەیتە سەر خۆت؟ ئەوە بۆ تۆ نییە هەڵیبگریت و لە هێز و توانای تۆدا نییە.

هەندێک جار دەست بەسەر ترسەکاندا دەگرین. تەنها دەمانەوێت هەموو شتەکانی ژیانمان کۆنترۆڵ بکەین. پێویستە ئەوە لە یاد بکەین. ئەو کەسەی وابیر دەکاتەوە دەتوانێت چارەسەری هەموو لایەنەکانی ژیانی بکات بەردەوام نیگەرانی و پەرێشانی زۆری دەبێت. ئەم دوو لایەنەش پێکەوە پەیوەستن. دەزانیت بۆچی وایە؟ چونکە ئەرکێک لە ئەستۆ دەگریت کە لە توانا و دەسەڵاتی تۆدا نییە. دەسەڵاتت بە سەریدا نییە و واز لەو بیرکردنەوەیە بهێنە. تۆ ئەو کەسە نیت توانای تەواوەتیت هەبێت بۆ چارەسەرکردنی هەموو گرفتەکانی خۆت، خێزانت، هاورێیانت و هەموو کەسێکی جیهان. بگەڕێرەوە بۆ لا حول ولا قوة إلا بالله و دەتوانیت دووبارە بخەویتەوە.

تێگەیشتنی خۆت بگۆڕە لەبارەی ئەوەی چارەسەرەکە لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت و شتەکان لە کوێوە چارەسەر دەکرێن. چارەسەرکردنی گرفت بەوە نابێت تەواوی شەو بەئاگا بیت و بیری لێ بکەیتەوە. ڕەنگە بڵێیت ئەی چی لەبارەی ئەرکی سەرشانی خۆمەوە؟ وەکو پێشتر ئاماژەمان پێ دا، ئەگەر ترست هەبێت، نزا بکە و پرسیار لە خۆت بکە ئەو کارانە چین پێویستە ئەنجامیان بدەیت. ئەو کارانە ئەنجام بدە و چیدی هێندە بیری لێ مەکەرەوە. لە بیری بکە. تۆ بەرپرس نیت. تەنها شتێک پەروەردگار داوامان لێ دەکات ئەوەیە وشترەکەمان ببەستینەوە و پاشان تەوەکولمان بە پەروەردگارمان هەبێت. بە گشتی وشترەکەمان نابەستینەوە، بەڵکوو دەیخنکێنین.

کاتێک شتەکان لە یاد ناکەین، بەردەوام بیری لێ دەکەینەوە. ئەوەش ناتەندروستە. دواتر چی ڕوودەدات؟ هیچ شتێک ناگۆڕێت. تەنها ئازاری خۆت دەدەیت و خۆت ماندوو و شەکەت دەکەیت. لە کۆتاییدا هەمان ئەنجامی دەبێت.

هەندێک جار نازانین چۆن واز لە خەیاڵاتەکانمان بهێنین. کارەکەی خۆت ئەنجام دا، وشترەکەت بەستەوە و تەوەکولت بە پەروەردگارت هەبوو. ئەوە لەیادکردن و فەرامۆشکردنی گرفتەکەیە.

لا حول ولا قوة إلا بالله، ژیانت دەگۆڕێت. وشترەکەت دەبەستیتەوە، وەلێ بەرپرسیار نیت. خۆت چارەسەری ناکەیت. تەنانەت دووبارەکردنەوەی لا حول ولا قوة إلا بالله، زۆر بەهێز و موعجیزەئاسایە. وەکو یادخەرەوەیەک هەوڵ بدە بەئاگا بیت لەوەی دەیڵێیت. لە ڕاستیدا هیچ شتێک ناگۆڕێت و هیچ هێز و دەسەڵاتێک نییە جگە لە پەروەردگار. ئەوە لە دەسەڵاتی تۆدا نییە و تۆ هۆکاری گۆڕانەکە نیت.

لا حول ولا قوة إلا بالله، دووبارە بکەرەوە و لە ناخەوە باوەڕت پێی هەبێت. کاریگەرییەکی زۆری دەبێت، نەک تەنها لە ڕووی دەروونی و بەختەوەریتەوە، وەلێ لەسەر بارودۆخەکەیش. لا حول ولا قوة إلا بالله، چارەسەری گرفتە ئەستەمەکان دەکات بە شێوەیەکی موعجیزەئاسا. لە ڕاستیدا لە شوێنانێک دەرگا بە ڕووتدا دەکاتەوە خۆت هەرگیزاوهەرگیز پێشبینیت نەدەکرد.



## بەندی دەیەم

# بەخشندەیی

یەکێکی دی لەو هۆکارانەی بەختەوەری زیاد دەکات، دوای بەئاگابوون و سوپاسگوزاری، بریتییە لە خزمەتکردنی کەسانی دی. خزمەتی کەسانی دی بکەیت و بەخشندە بیت.

پارە بەختەوەری ناهێنێت. ئەوە وتەیەکی هەڵەیە. پارە بەختەوەری دێنێت کاتێک لە کەسانی دیکەدا خەرجی دەکەیت. توێژینەوەکان دەریانخستووە ئەوانەی پارە لە کەسانی دیکەدا خەرج دەکەن، بەختەوەرییان زیاد دەکات. وەلێ کاتێک پارەکە لە خۆیاندا خەرج دەکەن هەمان کاریگەری نابێت لەسەریان.

توێژینەوەیەکیان ئەنجام دا، چەند کەسێکیان هێنا بەسەر چوار گرووپدا دابەشیان کردن، بە گرووپێکیان وترا هاوکاری و یارمەتی کەسێکی دیکە بدەن بە تەنها. بە گرووپی دووەم وترا یارمەتی و هاوکاری کەسانی دیکە بدەن لەسەر ئاستی کۆمەڵگادا. بە گرووپی سێیەم وترا خۆشی و شادی لە کاتی خۆیان وەرگرن. گرووپی چوارەم بەردەوام بوون لە کاری ڕۆژانەی خۆیان. لە توێژینەوەکەدا

چییان بۆ دەرکەوت؟ بە هیچ جۆرێک بەختەوەرییەکەیان زیادی نەکرد جگە لە گرووپی یەکەم و دووەم کە خزمەتی کەسانی دیکەیان دەکرد. پارەخەرجکردن لە خۆیاندا بەختەوەرتری نەکرد. خزمەتکردنی کەسانی دیکە یەکێکە لە ڕێگا بەهێز و کاریگەرەکانی زیادکردنی بەختەوەریمان، سبحان اللە.



## بەندی یازدەیەم

# زیکر و یادی پەروەردگار

یەکێک لە هۆکارەکانی ئازارچەشتنمان تەواو سادە و ساکارە. ئەگەر کەسێک بڕوات بۆ لای پزیشک و سکاڵا بکات «تەواو هەست بە ماندوویی و بێهێزی دەکەم. هەموو ئەم گرفتانەم هەیە...» پزیشکەکە بۆی دەردەکەوێت ڕێژەی ئۆکسجینی ئەم کەسە زۆر نزمە. یەکەمین شت پزیشکەکە دەڵێت: «ئەمە هۆکارەکەیە. پێویستت بە ئۆکسجینی زیاترە. ڕێژەی ئۆکسجینی جەستەت زۆر کەمە.» پێویستمان بەم هۆکارە هەیە تاکو ڕزگار ببین. ئۆکسجین پێویستیی سەرەکی ئێمەیە.

لە ڕووی ڕۆحییەوە ئۆکسجین بریتییە لە زیکر و یادی پەروەردگار. نوێژ، ئەگەر کەسێک نوێژ نەکات، بە ڕێکوپێکی نوێژ نەکات، یاخود زیکر و یادی پەروەردگار نەکات لە ژیانیدا، وەک ئەوەیە هەناسە نەدات. بەم چەشنە ئازار دەچێژین.

ئەگەر کەسێک هەناسە نەدات، نایەیت باسی ڕاکردن لە ماراسۆنی بۆ بکەیت. کاتێک دێتە سەر لایەنی ڕۆحی، ئەگەر کەسێک نوێژ هەر نەکات، نایەیت باسی ئەوەی بۆ بکەیت چۆن لە ڕووی دەروونی

و هەستییەوە جێگیر و بەهێز بێت. ئەو تەنانەت هەناسەش نادات. تەنها یەکەمین شت دڵنیابەرەوە لە: ئایا ئۆکسجین وەردەگریت؟ ئایا هەناسە دەدەیت؟

ئەگەر کەسێکی بێهۆش لە بەردەمتدا بێت، یەکەمین شتێک هەوڵی بۆ دەدەیت، بریتییە لەوەی ئایا ئەم کەسە هەناسە دەدات؟ پێویستە وەکو پزیشکی دەروونی خۆمان ئەم کارە بکەین. ئایا هەناسە دەدەم؟ نوێژەکانم چۆنن؟ ئایا ڕۆژانە پێنج نوێژە فەرزەکەم دەکەم؟ ئایا لە کاتی خۆیدا نوێژەکانم دەکەم؟

مەسەلەی ئەنجامدانی نوێژەکان لە ساتی خۆیدا بەم چەشنەیە: ئەگەر پزیشکێک بڵێت ئەمە دەرمانەکەتە و پێویستە ڕۆژانە پێنج جار بەکاری بهێنیت، بە زیندوویی دەتهێڵێتەوە. ئەگەر ئەو دەرمانە بەکار نەهێنیت، کاریگەرییەکی باش و ئەرێنی نابێت.

لەم حاڵەدا چی دەکەیت؟ دەرمانەکە بەکار دێنیت و لە کات و ساتی دیاریکراوی خۆیدا بەکاری دێنیت. بە هیچ شێوەیەک ناڵێیت: «سەرقاڵم، پێش خەوتن بڕی هەر پێنج ژەمەکە بەکار دێنم.» ناڵێیت «ئیمڕۆ سەرقاڵم، سبەی هەناسە دەدەم.» یاخود بەم چەشنە دەڵێین: «ئیمڕۆ هیچ حەزم لێی نییە».

وەکو کەسێک وایە بڵێت: «تەواو تێداچووم. زۆر ناساغ و نەخۆشم، بۆیە لە هەناسەدان دەوەستم.» ئەوە شتێکی ساویلکانە و نەفامانەیە، وەلێ هەر خودی خۆیشمان ئەمە دەڵێین.

گرفتەکە لەوەدایە بە جۆرێک لە نوێژەکان دەڕوانین وەک شتێک بتوانین بێ ئەوانیش بژین. بە هیچ چەشنێک بێ نوێژەکان ناژیت، هەروەک چۆن بێ ئۆکسجین ناژیت. نوێژ گرنگ و بایەخدارە. گرنگ نییە چی لە ژیانتدا دەگوزەرێت چەشنی گرنگی و بایەخی ئۆکسجین. کاتێک مژۆڵ و سەرقاڵیت، هێشتا هەناسە دەدەیت. کاتێک دەچیتە

بازاڕ بۆ شتکڕین، هێشتا هەناسە دەدەیت. کاتێک لە خوێندنگایت، هێشتا هەناسە دەدەیت. کاتێک لە فڕۆکەخانەیت، هێشتا هەناسە دەدەیت.

کاتێک چەشنی ئۆکسجین لە نوێژ دەڕوانیت، بە هیچ چەشنێک سازشی لێ ناکەیت، وازی لێ ناهێنیت و کەمتەرخەمی تێدا ناکەیت. درک بەوە دەکەیت کات و ساتی دیاریکراوی نوێژەکان چەشنی ڕەچەتەی دەرمانی پزیشکە. پەروەردگار باڵاتر و زاناترە لە هەموو پزیشکان. پەروەردگار زانایە بەوەی دەیکات. کاتێک دەڵێت نوێژی بەیانی لەنێوان ئەم کات بۆ ئەو کاتە، مانای ئەوە نییە هەرکات خەبەرت بوویەوە ئەو کات ئەنجامی بدەیت.

پێویستە زۆر پابەندی ئەو دەرمانانە بین کە ژیانمان پێ دەبەخشن و لە ساتی دیاریکراوی خۆیاندا بەکاریان بهێنین. شتانێکی زۆر سادە و ساکاری وەک سەرئاوکردن دواناخەین. یەکێک لە خوشکانی ئیماندارم باسی ئەوەی کرد، کاتێک لەسەر کارە و لە باخچەیەکی ساوایان مامۆستایی دەکات، ناتوانێت نوێژەکانی بکات. وتی ناتوانێت منداڵەکان جێبهێڵێت. پاشان پرسیاری لێ کرا: «چۆن دەڕۆیت بۆ سەرئاو؟» وتی: «مامۆستایەکی دیکە دێنم تاکو شوێنەکەم بگرێت و بڕۆم بۆ سەرئاو.» ئینگلیز وتەنی کاتێک ویست و ئامانجێک هەبێت، بێ دوودڵی ڕێیەک دەبێت.

گرنگ نییە ئەو کۆبوونەوەیەی تێیدایت چەندە بایەخدار و گرنگە، یاخود ئەوەی لە تاقیکردنەوەدایت، ئەگەر پێویست بە چوونە سەرئاو بکات، بێگومان دەچیت. خاڵی گرنگ لێرەدا بریتییە لەوەی سەرئاوکردن کاتێکی زیاتر دەخایەنێت لە ئەنجامدانی نوێژ. شتێکی زۆر سەیر و نامۆیە ئێمەی مرۆڤ بەو چەشنە بیر دەکەینەوە.

کاتێک نوستوویت و کاتژمێر پێنجی بەیانییە و هەست بە

شەکەتی و ماندوویی دەکەیت، وەلێ پێویستت بە چوونە سەرئاوە، چی دەکەیت؟ بۆچی هەڵدەسیت؟ چونکە ڕێسایەکت هەیە. جێی نوستنەکەت جێدێڵیت، گرنگ نییە چەندە ماندووی، یاخود جێیەکەت ئاسوودەیە، پاشان دەڕۆیت بۆ سەرئاو. ئەمە پێی دەوترێت ڕێسا، چونکە ڕەنگە میز بکەیت بە خۆتدا، بەڵام تۆ ئەوە ناکەیت.

ئەمە گرفتەکەی ئێمەیە. گرنگی و بایەخ بە پێویستییە جەستەییەکانمان دەدەین، وەلێ بایەخ بە پێویستییە ڕۆحییەکانمان نادەین.

شتێکی دی زۆر گرنگە لامان. بیهێنە خەیاڵت چی دەبێت ئەگەر بەڕێوەبەرەکەت ببینێت میز بە خۆتدا دەکەیت لە کاتی کۆبوونەوەکەدا؟ ئایا ئەوە جێی شەرمەزاری نییە؟ دڵنیام هەرگیز سەرکێشی ئەم جۆرە شەرمەزارییە ناکەیت. دەبێت چی شەرمەزارییەک بێت لە بەردەم پەروەردگاردا کاتێک نوێژەکانت لەدەست دەدەیت؟ ئایا هەست بەو جۆرە شەرمەزارییە دەکەیت؟ نوێژەکەت نەکردووە و دواتخستووە. ئەوە جێی شەرمەزارییە لە کاتی خۆی دوای بخەیت.

پەیامبەری نازدار(ﷺ)، فەرموویەتی جیاوازی نێوان باوەڕدار و کافر بریتییە لە نوێژ. هیچ زانایەک ناڵێت دزی لە ئیسلام دەرت دەکات. ڕاستە دزی تاوانە، وەلێ هیچ زانایەک ناڵێت چیدی مسوڵمان نیت، چونکە دزیت کردووە. هیچ زانایەک ناڵێت زینا لە ئیسلام دەرتدێنێت. ڕاستە زینا یەکێکە لە تاوانە گەورەکان، وەلێ ناتکاتە کافر و بێباوەڕ. هیچ زانایەک ناڵێت کوشتن لە ئیسلام دەرتدێنێت، هەرچەندە تاوانێکی گەورەیە. زانا هەیە دەفەرموێت ئەگەر نوێژ نەکەیت لە ئایینی ئیسلام دەردەچیت. ئەمە شتێکی زۆر ترسناکە، چونکە زۆر کەمتەرخەم و خەمساردین لە نوێژەکانماندا. ئەو شتەی گرنگە لە یادمان کردووە و سەرنجی زۆرمان لەسەر ئەو شتانەیە

کە گرنگ و بایەخدار نین. سەرنجی زۆرمان لەسەر شتە هەڵەکانە.

ئەگەر بە وردی لە ناخی خۆت بڕوانیت، چی گرنگە بە لای تۆوە؟ با ڕاستگۆیانە و ڕاشکاوانە بین. ئەوەی گرنگە لامان بریتییە لەوەی خەڵکی چۆن بیر دەکەنەوە؟ چۆن لە بەردەم خەڵکیدا دەردەکەوین؟ هەموو ئەم شتانە گرنگ نین. ئەو شتەمان بە تەواوی لە یاد کردووە کە گرنگە و جێی بایەخە. ئەوە تراژیدیایەکی سەختە و هۆکاری ئازارچەشتنمانە.

پەیامبەر موحەممەد(ﷺ)، دەفەرموێت، نوێژ یەکەمین شتە لەو دونیا و ڕۆژی لێپرسینەوەدا پرسیارمان لێ دەکرێت لە بارەیەوە. ئەگەر کەسێک نوێژەکانی بە ڕێکی و لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا ئەنجام بدات، سەرکەوتوو و سەرفراز دەبێت. ئەگەر بەو شێوەیەش نەبێت، تووشی خەسارەتمەندی و زەرەر دەبێت. کاتێک پرسیار لە ئەهلی دۆزەخ دەکرێت: «مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ» (المدثر: ٤٢)، چی ئێوەی هێنایە نێو ئاگری دۆزەخەوە؟ یەکەمین وەڵامیان بریتییە لە: «قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ» (المدثر: ٤٣) لە دەستە و گرۆی نوێژخوێنان نەبووین. ئەمەش شتێکی نهێنی و شاردراوە نییە، پەروەردگار لەم دەرئەنجامە ئاگاداری کردووینەتەوە.

نوێژەکانت نوور و ڕووناکین. یارمەتیت دەدەن لەنێو تاریکیدا ببینیت. بێ نوێژ تەواو نابینا و بێ پارێزەریت. پەروەردگار دەفەرموێت، نوێژ لە خراپەکاری و شەرمەزاری دەتپارێزێت. کاتێک واز لە نوێژەکانت دێنیت، وەکو ئەوەیە لە مەیدانی جەنگدا قەڵغانەکەی دەستت فڕێ بدەیت. هەروەها دەفەرموێت کاتێک کەسێک زیکر و یادی پەروەردگار لە یاد دەکات، چەندین دەرئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە. یەکێک لەو دەرئەنجامانە بریتییە لەوەی شەیتان پەیوەستت دەبێت و دەبێتە هاودەمی هەمیشەیی و ڕاوێژکارت.

دەتوانیت بهێنیتە خەیاڵت کاتێک شەیتان دەبێتە نزیکترین راوێژکارت؟ ئەوە ڕوودەدات کاتێک کەسێک لە زیکر و یادی پەروەردگار دوور دەکەوێتەوە. بەم چەشنە کەسەکە تووشی گوناهـ و تاوان دەبێت و خراپەی زیاتر ئەنجام دەدات. پارێزەری لە خراپە و تاوان فەرامۆش کردووە، بۆیە لای ئاسان دەبێت خراپەکاری و تاوان ئەنجام بدات. پاشان لە ڕووی ڕۆحییەوە نابینا دەبێت.

خەڵکی ئارەقت پێ نافرۆشێت لە ڕێی ڕوونکردنەوە و دەرخستنی ئەوەی چۆن کاریگەری خراپ لەسەر جگەرت جێدێڵێت، یاخود چۆن دەبێتە هۆی ئەوەی شۆفێرێکی سەرخۆش و مەست ئۆتۆمبێلێکی پڕ لە منداڵ لەناوبەرێت و بیانکوژێت. بەڵێ، ئەوەت بۆ دەخاتە ڕوو چۆن چەند کەسێکی مەست و سەرخۆش شادن و سەرنجی ڕەگەزی بەرامبەر ڕادەکێشن. شتێکی ناشرین و قێزەون دەڕازێنێتەوە لەپێش چاوەکانت. ئەمەش هەمان کاری شەیتانە. بۆ نموونە شەیتان زینا و پەیوەندی حەرامت لە لا دەڕازێنێتەوە و شیرینی دەکات.

ئەمانە دەرئەنجامی ترسناکی لەیادکردنی زیکر و یادی پەروەردگارە. لاوازبوویت لە بنەڕەتەوە، لاوازبوویت، چونکە ڕێژەی ئۆکسجین، خۆراک و ئاوت زۆر کەم بۆتەوە. ئەمانەی ڕوودەدەن نیشانەکانی نەخۆشی و دەردەکەن.

کاتێک کەسێک دێتە لات و دەڵێت دەمەوێت واز لە پۆشینی حیجاب بهێنم، گرفتەکە لەوەدا نییە ئەو کەسە یاساکان نازانێت، وەلێ گرفتەکە لە بنچینە و بنەڕەتەکەیدایە. هەندێک جار ئەمەش لە پەیوەندیمان لەگەڵ پەروەردگاردا ڕوودەدات. لق و گەڵاکان بریتین لە یاساکان.

پەروەردگار لە فەرمایشتێکی بەهێزدا پیمان ڕادەگەیەنێت و دەفەرموێت هیچ ڕێیەک نییە باشتر بێت بۆ نزیکبوونەوە لە پەروەردگار جگە لە ئەنجامدانی ئەو شتانەی فەرز و واجبن. ئەمە

فیلێکە لە ڕووی دەروونی و ڕۆحییەوە لە خۆمانی دەکەین. دەمانەوێت وەکو کەسێکی ڕۆحانی لە پەروەردگار نزیک ببینەوە، کەواتە پێویستە چی بکەین؟ پێ دەخەینە سەر فەرزەکان و فەرامۆشیان دەکەین و سوننەتەکان جێبەجێ دەکەین. سوننەتەکان بریتین لەو شتانەی فەرز نین لەسەرمان. بەڵێ، پەرستشە فەرزەکان فەرامۆش دەکەین. تەنها بۆ ئەوەی ببینە کەسێکی ڕۆحانی و خواناس و نزیک لە پەروەردگار. ئەوە ڕێسایەکی هەڵەیە.

کاتێک پەروەردگار دەفەرموێت کەسێک پابەندی فەرزەکان دەبێت، بەردەوام دەبێت لەسەر سوننەتەکان تاکو پەروەردگار خۆشی دەوێت. هەروەها دەفەرموێت: «کاتێک بەندەیەکم خۆش دەوێت، دەبمە گوێیەکانی کە پێی دەبیستێت، بینایی کە پێی دەبینێت، دەستەکانی کە هێرشی پێ دەکات، پێیەکانی کە پێی دەڕوات. ئەگەر داوای لێخۆشبوونم لێ بکات، بێگومان دەیبەخشم و لێی خۆش دەبم.» ئەوە پرۆسەکەیە. پێویستە پەیوەست بیت بە فەرزەکانەوە و هیچ لەدەست نەدەیت و لە یادی نەکەیت.

شتێکی دیکە بریتییە لە بیدعە. بیدعە چییە؟ بیدعە بریتییە لە داهێنان لە ئاییندا. وەکو بڵێین بە تەنها فەرمانەکانی نێو قورئان و فەرموودە و سوننەتەکانی پەیامبەر بەس نین.

کاتێک هەندێک لە هاوەڵان پرسیاریان لە شێوازی پەرستشی پەیامبەری نازدار کرد(ﷺ) و ڕاستییەکەیان بۆ دەرکەوت، وتیان: «ئێمە هیچ نین بە بەراورد بە پلە و پایەی پەیامبەرمان.» یەکەمیان وتی: «تەواوی شەوەکان شەونوێژ دەکەم و ناخەوم.» دووەمیان وتی: «هەموو ڕۆژێک بەڕۆژوو دەبم و نایشکێنم.» پاشان سێیەمیان وتی: «هەرگیز هاوسەرگیری ناکەم و بە سەڵتی دەمینێمەوە.» کاتێک پەیامبەری نازدار(ﷺ)، گوێی لەم سێ کەسە بوو تووڕە بوو.

پەیامبەر موحەممەد(ﷺ)، نزیکترین کەس بوو لە پەروەردگارەوە و زۆرترین ترسیشی لە پەروەردگار هەبوو، فەرمووی: «کەمێک دەخەوم و کەمێک شەونوێژ دەکەم، هەندێک جار بەڕۆژوو دەبم و هەندێک جار بەڕۆژوو نابم. هەروەها هاوسەرگیری ئەنجام دەدەم. ئەوەی لە سوننەت و ڕێگەی من لابدات لە من نییە».

کاتێک خەڵکی وا بیر دەکەنەوە لە ڕێی کار و کردەوەی دەرەوەی قورئان و سوننەتەوەچەند میلێک زیاتر پێش بکەون، ئەوە خۆفریودانە. ئەوەی پێویستمانە بۆ نزیکبوونەوە لە پەروەردگار بە کاملی و تەواوی لە قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پەیامبەری خۆشەویستدا ئاماژەیان پێ دراوە. پێویست بە کاری زیادە و داهێنان ناکات، چونکە بەو چەشنە هیچ بەرەوپێش ناڕۆین، بگرە بەرەو لادان و دواکەوتوویی دەڕۆین.



# بەندی دوانزەیەم

## کۆتایی

لە سورەتی (طه)دا ئایەتێک هەیە دەفەرموێت: (ئەوەی لە زیکر و یادی پەروەردگار دوور بکەوێتەوە، ژیانێکی نارەحەت بەڕێ دەکات و لە ڕۆژی دوایدا بە کوێری زیندوو دەکرێتەوە. پاشان بە پەروەردگار دەڵێت: «بۆچی بە نابینایی و کوێری زیندووت کردمەوە لە کاتێکدا بینا و چاوساغ بووم؟»).

ئەمە خوازەیە بەکار هاتووە. وا دەزانن توانای بینینیان هەبووە. ڕاستە بە چاوی سەر دەیانبینی، وەلێ چاوی دڵ و ناخیان کوێر بوو. پەروەردگار دەفەرموێت: «نیشانە و بەڵگەکانم بۆ ناردن، لە یادتان کردن. بۆیە ئیمڕۆ ئێوە لە یاد دەکرێن.» ئەمە باسوخواسێکی ترسناکە. ئەم نابینایی و کوێرییە ڕوودەدات کاتێک لە نوێژ و زیکر و یادی پەروەردگار دوور دەکەویتەوە. ئەوە نابینایی ڕاستەقینەیە. پەروەردگار دەفەرموێت، ئەوە نابینایی چاوی سەر نییە، وەلێ دڵە تووشی نابینایی و کوێری دێت. ئەو نابینایيە دەبێتە هۆی ونکردنی ڕێگەکەت، لەم شتە ڕامێنە.

بە گشتی ئێمەی مرۆڤ لەبارەی چۆنیەتی سارێژکردنی لاقێکی شکاوەوە، زۆر رۆشنبیرن. لەبارەی تیمارکردنی برینی گوللەوە زۆر زانایین، وەلێ زانیارییەکی زۆرمان لەبارەی چۆنیەتی سارێژکردنی دڵێکی شکاوەوە نییە.

برینی هەستەکان شتێکە ئێمەی مرۆڤ لە بەرامبەریدا دەستەوەستانین. پرۆسەی سارێژکردنەکە فێر نابین، ئامرازی گونجاومان نییە و لە سەرووی هەموویەوە پاڵپشتێکی تەواوی پرۆسەی سارێژکردنەکە نین کە گرنگە بۆ سارێژی دڵێکی شکاو.

کاتێک بریندار دەبیت، یاخود لە لایەن کەسێک و شتێکەوە ئازار دەدرێیت، چۆن چارەسەری خۆت دەکەیت؟ چی شتێک و چی کەسێک هاوکارتە لە پرۆسەی سارێژکردنەکەدا؟

خاتوو یاسەمین موجاهید بەوە ناسراوە کە لەڕێی بۆچوون و تێڕامانە ژیرەکانیەوە سەرنجی تەواوی بینەران و خوێنەرانی رادەکێشێت. بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە بەشی دەروونناسی بەدەست هێناوە، پاشان لە زانکۆی ویسکۆنسین مادیسۆن بڕوانامەی ماستەری لە رۆژنامەگەری و پەیوەندییەکان بەدەست هێناوە. لە ئێستادا خاتوو یاسەمین موجاهید بانگخوازێکی نێودەوڵەتی و نووسەرە، زۆربەی کارەکانی لەبارەی پەرەپێدانی رۆحی و کەسییەوەیە. یاسەمین موجاهید لە رێی یەکێک لە پرفرۆشترین پەرتووکەکانیەوە: «دڵت بێنەوە: تێڕامانی کەسی لەبارەی رزگاربوون لە کۆتوبەندەکانی ژیان»ـەوە زیاتر ناسراوە.



# بەندی یەکەم

## فریاگوزاری سەرەتایی هەستەکان

ئەم بابەتە زۆر لام سەرنجڕاکێشە و هەست دەکەم بابەتێک بێت پێویست بێت لە سەری بدوێین و دەست بە مەشق و ڕاهێنان بکەین تێیدا. ئەویش فریاگوزاری سەرەتایی هەستەکانە. ئێمە بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە زانیاریمان لەبارەی چارەسەرکردنی لاقێکی شکاوەوە هەیە. لەبارەی تیمارکردنی برینی گوللەوە، زۆر زاناین، وەلێ زانیارییەکی زۆرمان لەبارەی چۆنیەتی ساڕێژکردنی دڵێکی شکاوەوە نییە.

برینی هەستەکان شتێکە ئێمەی مرۆڤ لە بەرامبەریدا دەستەوەستانین. پرۆسەی ساڕێژکردنەکە فێر نابین، ئامرازی گونجاومان نییە و لە سەرووی هەموویەوە پاڵپشتێکی تەواوی پرۆسەی ساڕێژکردنەکە نین، کە گرنگە بۆ ساڕێژی دڵێکی شکاو.

ئەگەر کەسێک لاقی بشکێت، کەس پێی ناڵێت: «دەزانیت چی، لێیگەڕێ خۆی چاک بێتەوە، لە سەری بڕۆ.» بە کەسێکی لاق شکاو ناڵێیت لە سەری بڕۆ، چونکە دەزانیت لاقی شکاو پێویستە بە پرۆسەی چاکبوونەوەدا تێپەڕێت، پێش ئەوەی کەسەکە لە سەری

بڕوات، یاخود وەکو پێش شکانەکە لە سەری ڕابکات. بەداخەوە هەمان تێگەیشتن و خەمخۆریمان نییە کاتێک دێتە سەر باسی برین و شکانە هەستییەکان و دڵە شکاوەکان. پێشبینی دەکەین خەڵکی چاک ببنەوە. کاتی هاتووە. ئەم کاتە لە لایەن کێوە دیاری دەکرێت؟ لە لایەن خەڵکییەوە.

هەست دەکەم ئەمە زۆر گرنگ بێت بۆمان تاکو دەست بە فێربوون و فێرکردنی کەسانی دی بکەین. هەروەها نەک خودی خۆمان پێویستە بە منداڵەکانیشمان بگەیەنین. پێویستە بەشێک بێت لە پەروەردەی منداڵەکانمان. بەم چەشنە دەتوانین بکەوین و پاشان هەڵسینەوە. بەداخەوە بەم شێوەیە کەسانی دی فێر دەکەین: هەرگیز مەکەون و شکست مەهێنن. ئەم چەشنە فێرکردنەش زۆر سوودبەخش نییە.

ئەگەر ڕاهێنەرێکی وەرزشیت هەیە بە بەردەستەکانی بڵێت: «زۆر باشە، هەرگیز مەکەون و شکست مەهێنن.» بە دڵنیاییەوە ئامانجەکە تەنها شکستهێنان نییە، بەڵکوو وتنی: «هەرگیز شکست مەهێنە»یە بە کەسێک. ئەگەر هەرگیز فێریان نەکەیت، چی بکەن لە ساتی شکستهێناندا، مانای ئەوەیە ڕاهێنەرێکی زۆر باش و سەرکەوتوو نیت، چونکە حەقیقەتی ژیان ئەوەیە ساتێک دێت بخزێیت و شکست بهێنیت، جا گرنگ نییە چەندە وەرزشوانێکی بلیمەت و بەتوانایت.

وەرزشوانێکی یاری خلیسکێنەی سەر سەهۆڵ لە ساتێک لە ساتەکانی ژیانیدا خزاوە و کەوتووە. باشترین ڕاهێنەر ئەوانەن بەردەستەکانیان فێر دەکەن چۆن هەڵبستنەوە و چۆک دانەدەن. ئەو کەسەی بینیوتە لە پێشبڕکێ و نمایشدا، چی ڕوویداوە دوای شکستەکەیان؟ ئایا تاکو ئێستا وەرزشوانێکی یاری جمناستیک، یاخود خلیسکێنەی سەر سەهۆڵت دیوە خزابێت و کەوتبێت، پاشان

هەر لەسەر سەهۆڵ و زەوییەکە دانیشتبێت؟ هیچ کەسێک ئەو کارە ناکات. زۆر بە خێرایی هەڵدەستێتەوە و لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبێت. ئەمە بەشێکە لە ڕاهێنانەکانی و پێویستە بەشێک بێت لە ڕاهێنانەکانی ئێمەیش.

ژیان کامڵ و بێ کەموکورتی نییە و مرۆڤەکانیش بە هەمان شێوەن. مەحاڵە لە ژیاندا گوزەر بکەین و نەکەوین و شکست نەهێنین. مەحاڵە تووشی ئازار و شکان نەهاتبین، چونکە ئەمە ژیانی دونیایە نەک بەهەشت.

کەواتە بەشێک لە ڕاهێنان و فریاگوزارییە سەرەتاییەکەمان پێویستە ئەم فریاگوزارییە سەرەتاییەی هەستەکانمان بێت. فێربوونی ئەوەی چۆن سارێژ بین دوای شکانی دڵەکانمان. بۆیە هەست دەکەم زۆر گرنگ بێت، وەلێ زۆر لە یاد کراوە.

پێش ئەوەی بەردەوام بین، با ئامانجێک و مەبەستێک دابنێین لەبارەی ئەو شتەی دەمانەوێت لەم پەرتووکەوە فێری ببین. لە یادت بێت پەروەردگاری مەزن پێمان دەفەرموێت، مرۆڤەکان هیچ بەدەست ناهێنن، جگە لەو شتەی هەوڵی بۆ دەدەن. بۆیە پێویست و گرنگە بزانین بۆ چ شتێک هەوڵ دەدەین تاکو بەدەستی بخەین؟ پەیامبەرمان موحەممەد(ﷺ)، فەرمویەتی: هەموو کارێک بە نیەتە و پێویستە هەمووان نیەتی باش لە کارەکانیاندا هەبێت.

## بەندی دووەم

# کات بە تەنها سارێژکەر نییە

کاتێک بریندار دەبیت، یاخود ئازار دەچێژیت، بۆ ساتێک بیر لە برینێکی جەستەیی بکەرەوە، چی ڕوودەدات کاتێک بریندار دەبیت؟ یەکەم شت پێویستە پرۆسەی چارەسەرکردنی برینەکە هەبێت. هەروەها هەندێک پرۆسەی سارێژبوونی برینەکە هەبن. ئایا دەتوانین کارێک بکەین بۆ یارمەتیدان و سارێژبوونی برینی جەستەیی؟ وەڵامەکە «بەڵێ»یە. دەتوانین برینەکە خاوێن بکەینەوە، چاودێری بکەین و سەردانی پزیشک بکەین. ئەگەر کەسێک برینێکی گوللە لەسەر جەستەی بێت، شتانێک هەن تاکو بتوانن یارمەتی سارێژبوونی بدەن. هەروەها شتانێک هەن دەتوانن ئەنجامی بدەن بۆ ڕێگرتن، وەستاندن و دواخستنی سارێژبوونەکە. بۆ نموونە، ئەگەر کەسێک برینێکی هەبێت و هەرگیز خاوێنی نەکاتەوە و بە برینپێچ نەیپێچێت، چی بەسەر ئەو برینەدا دێت؟ لە ڕاستیدا برینەکە تووشی هەوکردن دەبێت. گرنگ نییە ئەگەر پێچابت. دەتوانیت بڵێیت: «ئۆی، برینێکی گوللە لەسەر جەستەمە، با بە برینپێچێک دایپۆشم، پاشان خۆی چاک دەبێتەوە.» بەو چەشنە سارێژ نابێت،

تەنها لەبەر ئەوەی داتپۆشیوە.

پاشان شتانێکی سەیر دەڵێن، وەک کات هەموو برینێک سارێژ دەکات. کات چی کردووە لە برینی گوللەکە کە هەرگیز خاوێن نەکراوەتەوە، چارەسەر نەکراوە و چاودێری نەکراوە، بەڵکوو تەنها پێچراوە؟ کات برینەکەی خراپتر کردووە، نەک ئەوەی سارێژی کردبێت. ئەو بۆچوونەی دەڵێت کات بە تەنها دەتوانێت سارێژی برین بکات هەڵەیە، چونکە ئەگەر برینەکە بە شێوەیەکی دروست چاودێری نەکرێت، یاخود شتانێک ئەنجام بدەیت برینەکە خراپتر بکەن، ئەو کات، کات سارێژی برینت ناکات. ئەگەر هەموو ڕۆژێک پیسی بخەیتە سەر برینەکە، توێژی سەر برینەکە هەڵبکەنیت، یاخود بەکتریا تێی بدات، ئەو برینە سارێژ نابێت، وەلێ دەبێتە هۆی خراپتربوونی برینەکە.

کەواتە شتانێک هەن دەتوانین ئەنجامیان بدەین بۆ یارمەتیدانی سارێژبوونی برینەکە و شتانێک هەن بە ئەنجامدانیان زیان بە برینەکە دەگەیەنین و ئازارەکەی ماوەیەکی زۆرتر دەخایەنێت. ئەمە ئەو شتەیە پێویستە فێر بین. دەروونناسان بۆیان ئاشکرا بووە چەندین خوو هەن مرۆڤەکان ئەنجامی دەدەن کە بەشدارن لە دواخستنی پرۆسەی سارێژبوون. ئەوە جۆرێکە لە لەناوبردنی خود. ئێمە نازانین خەریکین چی ئەنجام دەدەین و بە مەبەستەوە ئەو کارە ناکەین.

کەسێک درک بەوە ناکات لە ڕاستیدا پیسی دەخاتە سەر برینەکەی، توێژی سەر برینەکەی هەڵدەکەنێت و دەهێڵێت بەکتریا تێی بدات، وادەزانێت کات سارێژی برینەکەی دەکات: بۆچی کات سارێژی برینەکە ناکات؟



## بەندی سێیەم

## چی دەکەین؟

ئەو شتانە چین ئەنجامیان دەدەین و سارێژبوونمان دوادەخەن؟

یەکێک لەو شتانە دەروونناسان بە گرنگ و بەسوودی دەزانن لە یارمەتیدانی سارێژبوون، بریتییە لە پاڵپشتی کۆمەڵایەتی. مەرج نییە لە دەسەڵاتی خۆماندا بێت. پاڵپشتییەکە ڕەنگە چارەسەرکار، هاوڕێ، یاخود ئەندامانی خێزانەکەت بێت. ڕەنگە پێویستت بە پاڵپشتی هاوڕێ و خێزانەکەت بێت پێکەوە. کاتێک ئەو پاڵپشتە کۆمەڵایەتییەت بۆ نارەخسێت، دەبێتە هۆی ئازاردان و دواخستنی سارێژبوونەکە.

ئێمەی باوەڕدار پێویستە چی بکەین لەم چەشنە دۆخەدا، ئەگەر هاوکاری و پاڵپشتی کەسانی دیکەمان بۆ فەراهەم نەبێت؟ یەکەم، پێویستە بگەڕێینەوە لای پەروەردگاری مەزن. یەکێک لە ئامرازە گرنگ و سەرنجڕاکێشەکان کە هەمانە بریتییە لە پەیوەندییەکی پتەو لەگەڵ پەروەردگار. بۆ دەسکەوتنی هاوکاری و پاڵپشتی، دەگەڕێینەوە لای پەروەردگار. مانای ئەوە نییە نابێت هاوکاری و پاڵپشتی یەکدی بکەین. هەروەها مەبەست لەوە نییە پێویستمان بە هاوکاری یەکدی نییە و سوودی لێ وەرناگرین. وەلێ مەبەست لەوەیە پەروەردگار هەمیشە لە لاتە تاکو هاوکار و پاڵپشتت بێت.

## گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار:

ئەمە گرنگترین ئامرازی ساڕێژبوونە. بە تایبەتی کرداری مانای نزاکردن، نوێژ و فرمێسکڕشتنی زۆر دەگەیەنێت. یەکێک لە ئەفسانەکان کە پێویستە لەبیری خۆمانی بەرینەوە بریتییە لەوەی فرمێسکەکان نیشانەی لاوازین، گریان مانای ئەوەیە لاوازیت و نەگریەیت، مانای ئەوەیە بەهێزیت. ئەمە چ لە ڕووی ئیسلامی و چ لەڕووی توێژینەوەکانی دەروونناسییەوە، بە هەموو شێوەیەک هەڵەیە.

توێژینەوەکانی دەروونناسی پێمان دەڵێن کاتێک کەسێک هەستەکانی کپ دەکات، نابێتە هۆی لەناوچوون و نەمانی هەستەکانی. لە ڕاستیدا هەستەکەی زیاتر گەشە دەسەنێت. دەڵێن، هەوڵدان بۆ کپکردنی هەستەکان و دوورکەوتنەوە لێیان، دەبێتە هۆی زیادبوونی. هەستەکە زیاتر و ئاشکراتر دەبێت.

ئەم بۆچوونەی هەست و گریان نیشانەی لاوازین، تاکو سەر ئێسقان هەڵەیە. کاتێک پەیامبەرمان موحەممەد(ﷺ) گریا و یەکێک لە هاوەڵان تووشی سەرسامی بوو و پرسی: ئەم گریانە چییە ئەی پەیامبەری خودا(ﷺ)؟ پەیامبەری نازدار(ﷺ) فەرمووی: ئەمە ڕەحمێکە پەروەردگار خستوویەتیە دڵی باوەڕدارانەوە.

بەڵێ، بەم چەشنە پەیامبەرمان(ﷺ) پێناسەی گریان و فرمێسکڕشتنی کردووە. ئەمە نیشانەی لاوازی نییە و هەڵەیەک نییە لە دروستکراوەکانی پەروەردگاردا، وەلێ ڕەحمەتێکی ئیلاهییە. کەواتە نکوڵیکردن لەم بەشە سروشتییەی ساڕێژبوون زۆر مەترسیدارە. ئەگەر نکوڵی ئەم ڕاستییە بکەیت، هەمیشە درک بەوە دەکەیت ساڕێژبوونەکەت دوادەکەوێت. دەبێتە ڕێگر لە

بەردەم سارێژبوونی برینەکەدا، چونکە ئەمە دروستکراوی ئیلاهییە. پەروەردگار فرمێسک و گریانی وەکو ڕەحمەتێک پێ بەخشیوین و خاوێنکەرەوەیە. بەشێکە لە پرۆسەی سارێژبوونەکە.

چۆن ئەم کارە ئەنجام بدەین؟ ئەگەر تەماشای گەورەترین کەسەکانی سەر زەوی بکەیت، کێن ئەو کەسانە؟ پەیامبەر موحەممەد(ﷺ) دەفەرموێت: گریان و دڵڕەق نەبوون. پەیامبەر یعقوب(عليه السلام)، هێندە گریا تاکو بینایی لەدەست دا. پەیامبەری نازدارمان(ﷺ) بەساڵی ماتەمدا تێپەڕی، کاتێک خاتوو خەدیجەی هاوسەری و ئەبوتالیبی مامی لەدەست دا. ئەوان هەستیان هەبوو و هەستەکانیان دەردەبڕی. ئەمەش مانای ئەوە نەبوو ئارامگر نین.

ئەگەر تەماشای نموونەیەکی نێو قورئانی پیرۆز بکەیت، پیاوێکە ئارامگرییەکی جوانی هەبووە، کەسێک بووە هێندە گریاوە بینایی چاوانی لەدەست داوە. ئەویش پەیامبەر یعقوبە(عليه السلام). کەواتە بۆت ڕوون بوویەوە گریان و ئارامگرییەکی جوان دژیەک نین؟

ئارامگری شتێک نییە تەنها بە ڕووکەش ڕووبدات و دەرکەوێت. ئارامگری لە قووڵایی ناخەوە سەر هەڵ دەدات. کاتێک پەیامبەری نازدار(ﷺ) خەمبار بوو، ئەم فەرمایشتە جوانەی فەرموو: «چاوەکان فرمێسک دەڕژن، دڵ هەست بە خەم دەکات، وەلێ زار هیچ شتێک دەرنابڕێت جگە لەوەی پەروەردگار پێی ڕازییە.» ئەمە ئارامگرییە. هەست بە خەمباری دەکات و فرمێسک دەڕژێت، وەلێ سکاڵا لە پەروەردگار ناکات. ئەمە مانای ناڕازیبوون نییە، بەڵکوو وەکو مرۆڤێک هەست بە خەمی لەدەستدانی ئازیزێک دەکات.

ئەبوبەکر(رضي الله عنه) یەکێک بوو لەو هاوەڵانەی مژدەی بەهەشتی پێ درابوو، نازناوی (البکاء) بوو، واتا کەسێک زۆر بگریەت. کاتێک پەیامبەر(ﷺ) لە سەرەمەرگدا بوو، بە خاتوو عائیشەی فەرموو:

«بە باوکت بڵێ پێشنوێژی بۆ موسوڵمانەکان بکات.» وەڵامی خاتوو عائیشە چی بوو؟ «باوکم زۆر دەگری.» پەیامبەر جارێکی تر پێی فەرموو: «بە باوکت بڵێ پێشنوێژی بۆ موسوڵمانەکان بکات».

تەنانەت پیاوێکی وەکو عومەری کوڕی خەتتاب(﵁) شوێنی گریان لە ڕووخساریدا دەرکەوتبوو. هیچ دژایەتییەک نییە لەنێوان پیاوێتی و گریاندا، یاخود ئارامگری و گریاندا.

کەواتە یەکەمین شت کە پێویستە بیکەین، بریتییە لە تێکشکاندنی ئەم ئەفسانەیەی دەڵێت: گریان مانای ئەوەیە ئارامگر نیت. خەڵکی فێرت دەکەن و دەڵێن: «هەستەکانت کپ بکە، تاکو ئارامگریت هەبێت.» ئەمە ترسناکترین شتە بە کەسێکی بڵێیت.

ئەگەر ئەم وتەیە بڵێیت: هەستی ئەو کەسە ژەهراوی دەبێت و دەبێتە شتێکی تەواو مەترسیدار کە تووڕەییە، بەتایبەت تووڕەیی لە پەروەردگار. لەم شتە ڕامێنە. هەست شتێکە دەبێت مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت. ئەگەر مامەڵەی لەگەڵدا نەکەیت، نارەوێتەوە و لەناو ناچێت، بەڵکوو ژەهراوی دەبێت. تەنها مەبەستم لە ژەهراویبوونی خوازە نییە. هەستێکی دەرنەبڕدراو دەتوانێت زیانی تەندروستیت پێ بگەیەنێت. زۆر ژەهراوی دەبێت و دەگۆڕێت بۆ شێرپەنجە.

دابنێ خەمباریت و دەرینابڕیت، کپت کردووە، یاخود دەتەوێ لێی دوور بکەویتەوە، هاوشێوەی برینێکی گوللە کە تەنها بە برینپێچێک دەیپێچیت، دواتر تووشی هەوکردن دەبێت. ئەمەش بۆ هەستە دەرنەبڕدراوەکانمان ڕوودەدات.

ڕەنگە سەرەتا تەنها خەمێک بێت، بەڵام چونکە دەرنەبڕدراوە، کپ کراوە و خەڵکی چواردەورت وتوویانە: ئارام بگرە، لە ناختدا بیهێڵەوە، واز لە خەمخواردن بهێنە و بەهێز بە. ئایا بە ڕاستی وا هەست دەکەیت لە پەیامبەر یعقوب(ﷺ) بەهێزتری؟ پەیامبەر

یعقوب(ﷺ) وەکو نموونـەی ئارامگرییەکی جوان «الصبر الجميل»، لـە قورئانـی پیـرۆزدا ئامـاژەی پـێ دراوە.

کاتێک ئـەم هەستە دەرنابڕدرێت و کەسانی دی ڕێگری دەکـەن، هەسـت دەکەیـت ناتوانیـت خەمباریـی خـۆت دەربخەیـت، چونکـە کەسـانی دی قبوولـی ناکـەن، یاخـود بـە لاوازت دادەنێـن. دەتەوێـت هەمـووان بـە بەهێـزت بزانـن، وایـە؟ کەواتـە هێـز و توانـای ئـەوەت نییـە دەریببڕیـت، یاخـود ڕەنگـە خـۆت بڕیـار لەسـەر هەسـتەکانی خـۆت بدەیـت. هەسـتەکانمان پەیوەسـتن بـە دەربڕینیایـەوە.

ئێمـە زۆر بڕیـار دەدەیـن. بڕیـار لەسـەر کەسـانی دی و خـودی خۆیشـمان دەدەیـن. هەسـتێکت هەیـە: پێویسـتە خـۆت چارەسـەری بکەیت و هیـچ دەرفەتێکت نەڕەخسـاندووە تاکو دەریببڕیت. چەشـنی خواردنێکـە لـە دەرەوەی چێشـتخانەدا بـۆ چەنـد هەفتـە و مانـگ جێـی دەهێڵیـت، چـی بەسـەردا دێـت؟ پێشـتر کێکێکـی بـە پەنیـری بەتـام و بەلـەزەت بـووە، ئێسـتا بـە کـەڕوو داپۆشـراوە. ئەمـە بەسـەر ناخـی کەسـەکاندا دێت. هەسـتەکانیان ژەهراوی دەبن. خـەم و ناڕەحەتییەکە ژەهـراوی نەبـوو، تەنهـا پێویسـتی بـە چارەسـەر هەبـوو، پێویسـت بـوو چارەسـەری بکەیـت و تێـی بپەڕێنیت، پێویسـتە بگەڕێیتـەوە لای پەروەردگارت، بـەڵام دەکرێت چارەسـەر بکرێت و خاوێن بکرێتـەوە ئـەو کات تێـی دەپەڕێنیت.

ئەگـەر ئـەو کارە نەکەیت، ژەهـراوی دەبێت. پاشـان دەگۆڕێت بـۆ ڕق و تووڕەیی. لە ناخەوە ڕەق و شـێواو دەبیت. ڕق و تووڕەییەکەت تەنهـا بەرامبـەر دونیـا نابێـت، بەڵکـوو بەرامبـەر پەروەردگاریـش دەبێـت. «تـووڕەم لـە پـەروەردگار لەبـەر ئـەوەی چـۆن توانیوێتـی ئەمـەم بەسـەردا بهێنێـت؟» ئێسـتا دەزانیت بۆچـی ئەمـە ڕوودەدات و ئەمـەش ترسـناکترین و ژەهراویتریـن شـتە؟ ئـەوە برینـی گوڵلەکەیـە

کە چارەسەرت نەکردووە، تەنها پێچاوتە و پاشان هەوی کردووە.

بگەڕێرەوە لای پەروەردگار و هەستی پێ بکە، خەم بخۆ، هیچ شەرمەزارییەک لە مرۆڤبوونتدا نییە، چونکە پەروەردگار خۆی بەم چەشنە خوڵقاندویتی. پەروەردگار هەڵە و کەموکورتی لە کارەکانیدا نییە. کەواتە مرۆڤ بە و بە پرۆسەکەدا تێپەڕە، بەو چەشنەی پەروەردگار دروستی کردوویت. پەروەردگار دەفەرموێت: فرمێسک ڕەحمەتێکە خستوویەتیە نێو دڵی باوەڕدارانەوە. ئەو ڕەحمەتە قبووڵ بکە، بەکاری بهێنە و بە پرۆسەی سارێژبووندا تێپەڕە.

لە ساتی نزا و نوێژەکاندا بە چاوی پڕ فرمێسکەوە، بگەڕێوە لای پەروەردگارت، بە تایبەت لە ساتی شەونوێژدا و سێیەکی کۆتایی شەودا. یەکێکە لە باشترین شتەکان دەتوانیت بۆ سارێژبوون ئەنجامی بدەیت. پەیامبەرمان موحەممەد(ﷺ)، لە فەرمایشتێکیدا دەفەرموێت، لەو ساتەدا پەروەردگار دێتە سەر یەکەمین ئاسمان و دەفەرموێت: «کێ بانگم دەکات تاکو پێی ببەخشم و هاوکارییان بکەم؟ کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات؟» پەروەردگار لەو کاتەدا بەشوێن ئەو کەسانەدا دەگەڕێت. ئەوە یەکێکە لە باشترین ساتەکانی سارێژبوون. ئەوە ژووری فریاکەوتنی خێرایە.

هانا بۆ پەروەردگار ببە و بگری بۆ یارمەتی. پێویست ناکات خۆت بە بەهێز بنوێنیت. تەواو ڕاستگۆ و ڕاستەقینەبە لەگەڵ زاتی مەزنی. هەست بە شکان بکە و بگری. بەڵێن دەدەم ئەوە خێراترین ڕێگای سارێژبوونە.

کاتێک تەماشای نزای پەیامبەران دەکەیت، زۆر بەهێز و پڕ مانان. بۆ نموونە نزای پەیامبەر ئەیوب(ﷺ). ئەم نزایەم زۆر خۆش دەوێت، چونکە تووشی نارەحەتی هات. نارەحەتی لەدوای نارەحەتی تووشی دەهات. تەندروستی خراپ بوو، سەروەتەکەی

و خێزانەکەی لەدەست دا. دوای چەندین ساڵ ئارامگری، هانای بۆ پەروەردگار برد و فەرمووی: تووشی نارەحەتی هاتووم، تۆیش بەڕەحمترینی ئەی پەروەردگارم.

پەیامبەر نوح(ﷺ) دوای ٩٥٠ ساڵ ململانێ و هەوڵدان هانای بۆ پەروەردگار برد و فەرمووی: «ئەی پەروەردگار بەڕاستی تێکشکاو و دۆڕاوم، سەرکەوتنم پێ ببەخشە».

هەموویان بەم چەشنە هانایان بۆ پەروەردگار برد و هەرگیز خۆیان نەنواند و نەیانوت: «خۆم چارەی دەکەم، من زۆر باشم لەم کارەدا.» هەرگیز بەو چەشنە ڕەفتاریان نەکرد.

«باوەڕم زۆر بەهێزە.» یاخود «من بەهێزم.» نەخێر، بەهێز نیت. تۆ مرۆڤێکیت و پێویستت بە یارمەتی و هاوکاری پەروەردگارە. ئەگەر پشت بە هێزی خۆت ببەستیت، بە هیوای بەختێکی باش. کەسمان لە پەیامبەران بەهێزتر نین. ئەوان هەرگیز پشتیان بە خۆیان و هێزی خۆیان نەبەست.

پەیامبەر یونس لەنێو سکی نەهەنگەکەدا گیری خواردبوو، هانای بۆ پەروەردگار برد و فەرمووی: ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (الانبیاء: ٨٧). واتە: «هیچ کەس و شتێک شایستەی پەرستن نییە، جگە لە زاتی مەزنت. پەروەردگار باڵادەستە بەسەر هەموو شتێکەوە، لە ڕاستیدا من لە ستەمکاران بووم».

پەیامبەران ملکەچ دەبوون و هانایان بۆ پەروەردگار دەبرد و هەرگیز پشتیان بە خۆیان نەدەبەست. بەم چەشنە ئەوان پارێزران و ڕزگاریان بوو. پەروەردگار هیچ کامیانی لەو دۆخە دژوارەی تێیدایە، نەهێشتەوە. بیر لەوە بکەرەوە پەروەردگار هەموویانی پاراست و ڕزگاری کردن.

پەروەردگار پەیامبەر یونس و ئەیوب و نوح(ﷺ) و هەموویانی

پاراسـت و ڕزگاری کـردن، وەلـێ ئـەوان بـەم چەشـنـە هانایـان بـۆ پـەروەردگار برد و تەنها پشتیان بە خۆیـان نەبەست. خۆیـان ملکەچ کـرد و داوای یارمەتـی و پشـتیوانی ئیلاهیـان کـرد.

تەنانـەت کاتێک تەماشـای باوکـە ئادەم(ﷺ) دەکەیت دوای ئـەوەی لـە میـوەی درەختەکـەی خـوارد، بـە پـەروەردگاری فەرمـوو: «ئێمـە ستەممان لـە خۆمـان کـرد. ئەگـەر لێمـان خـۆش نەبێت و ڕەحممـان پێ نەکەیت، بێ دوودڵی لە خەسـارەتمەندان و دۆڕاوانیـن.» دووبـارە پشـتی بـە پـەروەردگاری تـاک و تەنهـا بەسـت و پـەروەردگار لێـی خـۆش بـوو.

کەواتـە یەکەمین شـتێک بریتییە لـە گەڕانـەوە بۆ لای پـەروەردگار و هانـای بـۆ بەریت و لەگەڵیـدا ڕاسـتگۆ بێت. «ئـازاری هـەس و نارەحەتـە. ئـەی پـەروەردگار، هـاوکارم بـە، سـاڕێژم بکـە و لـە سـەرمی ئاسـان بکـە.» داوا لـە پـەروەردگار بکـە نارەحەتییەکانـت لەسـەر سـووک بـکات. هـەوڵ مـەدە هاوشـێوەی چەتەیـەک بێـت و بڵێیت: «خـۆت دەزانیت من بەهێزم. خـۆم چـارەی دەکـەم، مـن بـاش دەبـم».

ئەگـەر کەسـێک نەگەڕێتـەوە لای پـەروەردگار و پشـتیوانی پـەروەردگار دەست نەخـات، سـاڕێژی برینەکـەی دوادەکەوێت. دەبێتـە هـۆی وەسـتانی پرۆسـەی سـاڕێژبوونەکەی.

## نەبوونی خەمخۆری خود:

ئەمـە کاتێـک ڕوودەدات لۆمـەی خۆمـان دەکەیـن. وەکـو پێشـتر ئامـاژەم پێ دا، خـەم دەخۆیت و دواتـر لۆمـە و سـەرزەنشـتی خـۆت دەکەیـت، چونکـە خـەم دەخۆیـت. هەسـتەکانی خـۆت دەربـڕە. ئـەوە تەنهـا کەسـانی دی نییـە، بەڵکـوو خۆمـان بەسـەر خۆمانـی دەهێنیـن.

ڕەنگە سارێژ نەبێت و هەست بە تێکشکان بکەیت. بە خۆت دەڵێیت: «پێشتر سارێژ بووم!» تەنانەت خەمخۆریت بۆ خودی خۆیشت نییە. زۆر سەرزەنشت و لۆمەی خۆت دەکەیت. لات وایە هەستەکەت جێی قبووڵ نییە، چونکە تێکشکاو و هیوالێبڕاویت.

ئەمە دەبێتە هۆی دواکەوتنی سارێژبوونەکەت کاتێک خەمخۆری خۆت نیت و ڕێگە بە خۆت نادەیت بەو چەشنە هەست بکەیت. لە ڕاستیدا دەبێتە هۆی ئەوەی سارێژبوونەکە زیاتر بخایەنێت، بە پێچەوانەی ئەوەی هاوسۆز و هاوخەمی خۆت بیت.

بە دڵنیاییەوە خەڵکانی دیش ئەمە دەکەن، کاتێک پێت دەڵێن: «دەزانیت چی؟ کاتەکە کۆتایی هات، چیدی خەم مەخۆ، سارێژبە.» و هەروەها خودی خۆیشت هۆکار دەبێت.

بۆیە هاوسۆزی و هاوخەمی خود زۆر گرنگە. لە دەرنەبڕینی هەستەکانت و کپکردنەوەیان بوەستە.

### بیرکردنەوەی نەرێنیانە:

سێیەمین هۆکار کە پرۆسەی سارێژبوونەکە دوادەخات، بریتییە لە بیرکردنەوەی نەرێنیانە. بە مانایەکی تر بیرۆکەی نەرێنیانەت لەبارەی خۆتەوە هەس. بۆ نموونە کەسێک جێت دێڵێت، یاخود لە کەسێک دادەبڕێیت و جیا دەبیتەوە. بیرۆکەکە ئەوەیە، «چونکە من کەسێکی خۆشەویست نیم.» «من زۆر قەڵەوم»، «من زۆر جوان و قشت نیم.»، یاخود «لەبەر ئەوەیە من شایستە نیم.» ئەمانە هەمووی بیرکردنەوەی نەرێنین لەبارەی خۆتەوە. زۆر کەم و نزم لە خودی خۆت دەڕوانیت. بەم چەشنە سارێژبوونەکە دوادەکەوێت.

## زۆر سەرزەنشتکردنی خود:

شتێک ڕوودەدات، شتەکان بە باشی بەڕێوە ناچن، یاخود شتێک لە دەست دەدەیت، کە لات خۆشەویستە و دواتر سەرزەنشت و لۆمەی خۆت دەکەیت. «ئەوە هەڵەی منە.» «بەهۆی هەڵەیەکی منەوە بوو» ئەوەش دەبێتە هۆی دواخستنی سارێژبوونەکە. زۆر سەرزەنشتکردنی خۆت، یاخود لە ناخەوە لۆمەی خۆت بکەیت، کارێکی هەڵەیە.

## قبووڵنەکردنی ڕاستییەکان:

یەکێک لە گرفتەکان ئەوەیە بارودۆخێک قبووڵ ناکەیت کە ڕوویداوە، ئەمە دەبێتە هۆی دواخستنی سارێژبوونەکە. لە پەرتووکی «چۆن دڵێکی شکاو سارێژ دەکرێت؟»، کە نووسەرەکەی دەروونناسێکە، باس لە چەند حاڵەتێکی جودای نەخۆشییەکانی دەکات کە لە ماوەی بیست ساڵدا ڕوویانداوە. یەکێک لە نەخۆشەکانی دەڵێت: بە تەواوی دڵی شکاوە، چونکە لە پەیوەندییەکی خۆشەویستیدا بووە و وا پێشبینی کردووە هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو پیاوەدا دەکات، وەلێ لەجیاتی خوازبێنیکردنی، پیاوەکە پەیوەندی لەگەڵدا پچڕاندووە. دەروونناسەکە باس لەوە دەکات چۆن ئامۆژگاری کردووە و پێی وتووە یەکێک لەو شتانەی سارێژبوونی دوادەخات، بریتییە لەوەی هۆکاری دابڕان و جیابوونەوەکە قبووڵ نەکات. ئافرەتەکە ئەو هۆکارە ڕووکەشەی قبووڵ نەبووە کە پیاوەکە باسی لێوە کردووە، وا بیری کردۆتەوە هۆکارێکی تری شاردراوە هەیە و نزیکەی دوانزە مانگی بەسەر بردووە تاکو ئەو هۆکارەی بۆ ئاشکرا بێت. بۆیە ئێستا پێویستە ببێتە پشکنەرێک تاکو هۆکاری ڕاستەقینەی جیابوونەوەکە بزانێت.

جگە لە قبوولکردنی ئەو هۆکارەی پیاوەکە خستیە ڕوو «هەستەکانم هیچ زیادیان نەکردووە بۆت.» ئافرەتەکە بیری کردەوە، «نەخێر، دەبێت هۆکارێکی تر هەبێت.» و پەریشان بوو بۆ دۆزینەوەی ئەو هۆکارە. بیری لە کۆتایی هەفتەی ڕابردوو کردەوە و بیری لەوە دەکردەوە چی هەڵەیەکی کردبێت، دەبێت شتێکی جیاوازی وتبێت، سەرزەنشتی خۆی دەکرد، یاخود «ڕەنگە من شیاوی ئەمە، یاخود ئەوە نەبووبم».

ئەوەی ئەنجامی دەدا، هۆکاری دواخستنی سارێژبوونی بوو، چونکە هیچ ئامادە نەبوو ڕاستییەکان قبووڵ بکات. کاتێک پشکنەرێک کەیسێک دادەخات، ئەوە کۆتایی بە بابەتەکە دێنن. ئەو ئافرەتە کەیسەکەی دانەخست و هێشتا کراوە بوو. هاوشێوەی برینێکی کراوە و ئەم دۆخەی بەسەر خۆیدا هێنا.

بەپێی وتەی دەروونناسەکە وەک ئەوەبوو ئافرەتەکە بیەوێت بەڵگە بەدەست بهێنێت. بەڵگەی ئەوەی چی هەڵەیەکی هەبووە؟ لەبری تێگەیشتن لەوەی مەبەستی بووە، ئەو هیچ هەستێکی نییە. کۆتایی هات.

بۆیە قبووڵکردن یەکێکە لە ئامرازە گرنگەکانی سارێژبوونت. کاتێک کەسێک قبوولی ڕاستییەکان ناکات، دەبێتە هۆی درێژبوونەوەی پرۆسەی سارێژبوونەکە.

وەکو باوەڕدارێک کاتێک ئەمە دەخوێنیتەوە، یاخود گوێبیستی دەبیت، بزانە ئامرازێک لە ئایینەکەماندا هەیە. ئامرازێکی ڕۆحیمان هەس تاکو لەم گرفتەدا هاوکارمان بێت. ئەوەش «قدر الله و ما شاء فعل.» پەروەردگار ویستی لەسەرە و ئەو کارە دەکات کە ویستی لەسەرە. لە باوەڕمان و عەقیدەماندا هەندێک شت هەن، کە نەدەبوو ڕووبدەن. قبووڵکردنی ئەوە لە زوو سارێژبوونت، یارمەتیت دەدات. ئەوە نەدەبوو ڕووبدات و بۆم باش نەبوو و خێری تێدا نەبوو.

ئـەو ئامـرازە ڕۆحییەمـان هـەس، چونکـە دەزانیـن پـەروەردگار زانایـە بـە هەمـوو شـتێک و داهاتـوو. پـەروەردگار دەزانێـت ئێمـە نازانیـن و هەندێـک جـار شـتانێکمان دەوێـت خێـری تێدا نییـە بۆمـان. ئێمـە وەکـو بـاوەڕدار ئەمـە دەزانیـن. وەکـو پـەروەردگار لـە قورئانـی پیرۆزدا ئاماژەی پێ دەدات و دەفەرموێت: «هەندێک جـار ڕقمـان لـە شتێکە و خێری تێدایە بۆمـان، هەندێک جـار شـتێکمان خـۆش دەوێت و خراپـە بۆمـان. پـەروەردگار زانایـە و ئێـوە نازانـن».

ئـەوە ئامرازێکی فریاگوزاری سـەرەتایی گرنگە لە سـاڕێژبوونماندا. پێویسـتە درک بـەم ڕاسـتییە بکەیـن و گومانمـان نەبێـت پـەروەردگار لـە ئێمـە زاناتـرە. ڕەنگـە شـتێکمان ویسـتبێت و خێـری تێـدا نەبووبێت بۆمـان. تاکـو زووتـر ئـەو ڕاسـتییە قبـووڵ بکەیـت، زووتـر و خێراتـر سـاڕێژ دەبیت. ئـەو کەسـانەی نکوڵـی لـەو ڕاسـتییە دەکـەن و قبووڵـی ناکـەن، سـاڕێژبوونەکەیان دوادەخـەن.

## مامەڵەکردن لەگەڵ لەدەستداندا:

ئەمـە چـی دەگەیەنێت؟ لەبیرکردنـی هەمـوو خراپییەکانـی کەسـەکان و دۆخـەکان و یادکردنـەوەی چاکەکانیـان. بـۆ نموونـە کەسـێک دڵـت دەشـکێنێت و زۆر خراپە، بەڵام لە کۆتاییدا هەمـوو مامەڵە خراپەکانیان دیـار نامینێت. تەنها چاکەکانیان یـاد دەکەیتـەوە. پێش هەمـوو شـتێک ئەمـە فێڵکردنـە. یەکێکـە لـە فێڵـەکان کـە هـزرت لـە خۆتـی دەکات و سـاڕێژبوونەکە دوادەخات. نـەک ئـەوەی بیکەیتـە نموونەیـی، وەلـێ وا هەسـت دەکەیـت ئـەو شـتە کامـڵ و بێخەوشـە.

ئـەم دەروونناسـە بـە نەخۆشـەکانی دەوت لیسـتێک لـە سـیفەتە خراپەکانـی ئـەو کەسـە بنووسـن کـە دڵیانـی شـەقار کـردووە. پرسـیارێک بـوو لەبـارەی کەسـێک کـە لـە پەیوەندییەکـی هاوسـەری

خراپدا بوو و دواتر جیا بوویەوە، ئافرەتەکە هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکی تر کردەوە کە باش و چاک بوو، بە پێی قسەی ئەو کەسەی پرسیارەکەی کردووە، ئافرەتەکە هێشتا هەستی بۆ مێردە ستەمکارەکەی پێشوی هەیە.

یەکێک لە هۆکارەکان ئەوەیە هزرت فێڵت لێ دەکات. هەموو شتە خراپەکان دەسڕێتەوە و کاڵی دەکاتەوە. ئێمە لە یادیان دەکەین و تەنها یادی چاکەکانیان دەکەینەوە. ڕەنگە ببێتە هۆی چاکەی زیاتر و زۆریان بکات.

بۆیە دەروونناسەکە دەیوت: «لیستێک بنووسە.» هەموو ڕاستییەکان لەبارەی کەسەکەوە بنووسە. هەر کاتێک هزرت ویستی فێڵت لێ بکات، ئەو لیستە دەربهێنە و بیخوێنەوە. ئەمەش ڕاستییەکانت بیر دەخاتەوە.

## قسەکردنی نێو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان

ڕێگای دواتر بۆ دواخستنی سارێژبوونمان، بریتییە لە قسەکردن لە ڕێی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە لەگەڵ ئەو کەسانەدا. ئەم بابەتە زۆر جێی سەرنجە، بە چەشنێک بەشێکی تەواوی ئەم پەرتووکەی گرتۆتەوە.

شتەکە بێ زەرەر و زیان دەردەکەوێت، وەلێ بەداخەوە بێ زەرەر و زیان نییە. سارێژبوونەکەت زیانت پێ دەگەیەنێت لە ڕێی قسەکردن لەگەڵ ئەم پیاوەدا لە ڕێی فەیسبووک، ئینستاگرام، تویتەر و سناپچاتەوە. بەداخەوە ملیۆنان ڕێگەی جیاواز هەن بۆ قسەکردن لەگەڵ کەسێکدا لە ڕێی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە. ئەوە گرفتەکەیە. چەندین ڕێگە و شێوەی جیاواز هەن و بەکارهێنانیان سادە و ئاسانە.

دەتوانیت بە ئارامی لە ماڵەوە دانیشیت و قسە لەگەڵ ئەم کەسەدا بکەیت، بێ ئەوەی کەسی دی بزانێت. با پێتبڵێم ئەمە وەکو چی دەردەکەوێت. ئەمە چەشنی کەسێکی هۆگرە بە ماددەی بێهۆشکەر کە هەر جارە و برێک لە ماددەی بێهۆشکەر بەکار دێنێت. ڕێک بەو چەشنەیە. ئەمە وەکو خوازە و لێکچوواندن بەکار ناهێنم. کاتێک هۆگری کەسێک دەبیت و کاریگەری دەکاتە سەر هزر و مێشکت، چەشنی ماددەیەکی بێهۆشکەری وەکو هیرۆین و کۆکاینە.

کاتێک لەبەر هەر هۆیەک بێت پەیوەندییەکەتان هەڵدەوەشێتەوە و کۆتایی دێت، دەکشێیتە دواوە. ئەوە نیشانە بایۆلۆجییەکانی کشانەوەیە. دۆپامین و ئەوەی ڕوودەدات شتێکی کیمیاییە لە مێشکدا ئێستا لەدەستت داوە، چەشنی کەسێک لە ماددەی بێهۆشکەر دادەبڕێت. ئەوە لە مێشکدا دەردەکەوێت. کەسێکی هۆگریت بە ماددە بێهۆشکەرەکان و ئێستا لێی دابڕاویت.

بۆیە ڕۆیشتن و قسەکردن لە ڕێی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە، کارێکی ژیرانە نییە. چەشنی هۆگربوویەکی هیرۆینە، کاتێک دەڕوات و برێک ماددەی هیرۆین بەکار دێنێت. تۆ خەریکە واز لە هیرۆین دێنیت، بۆیە نابێت بە هیچ شێوەیەک نزیکی هیرۆین ببیتەوە. ئەگەر ئارەقخۆریت و وازت لە ئارەق هێناوە، نابێت نزیکی ئارەق ببیتەوە و چەند قومێک هەڵچۆڕیت. ئەگەر وازت لە جگەرەکێشان هێناوە، نابێت بە هیچ جۆرێک نزیکی جگەرە ببیتەوە.

ئەمە ئەو شتەیە خەڵکی ئەنجامی دەدات کاتێک درک بەوە ناکەن خەریکی چین و چی بەسەر خۆیاندا دێنن. چەشنی هۆگربوویەکی ماددەی بێهۆشکەرە دەڕوات بۆ ماددەی بێهۆشکەر و بەردەوام بڕی پێویست بەکار دێنێت. کەواتە چۆن بەو چەشنە واز لە هۆگربوون و ئالودەبوونت دێنیت و سارێژ دەبیت؟ وەڵامەکە بریتییە لەوەی واز

لە هۆگربوونەکەی ناهێنێت. دەبینیت ئەم کەسە بۆ ماوەیەکی زۆر چەقبەستوو دەبێت. بۆچی؟ وەڵامەکە زۆر سادەیە. ئەگەر کەسێک هۆگری ماددەی بێهۆشکەر بووبێت و بەردەوام بڕی پێویست لەو ماددەیە بەکار بهێنێت، هەرگیز واز لە هۆگربوونەکەی ناهێنێت و ساڕێژ نابێت.

پێویستە هاوشێوەی هۆگربوونی ماددەی بێهۆشکەر، مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت. پێویستە ڕاستەوخۆ واز لەو پەیوەندییە بهێنیت، چەشنی وازهێنان لە ماددەی بێهۆشکەر. ناتوانیت لە ڕێی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە قسە لەگەڵ ئەم کەسەدا بکەیت. پێویستە بلۆکیان بکەیت و بیانسڕیتەوە و لە هاوڕێیەتی لایان بدەیت. پێویستە ئەو کارانە ئەنجام بدەیت کە ئاماژەم پێ داوە، ئەگەر تەندروستی و سەلامەتی خۆتت لا گرنگە.

بەداخەوە ئێمەی مرۆڤ شتانێکی زۆر دەکەین کە خۆلەناوبردنە. ملکەچی ئارەزووەکانمان دەبین، بەڵام دواتر تووشی ئێش و ئازار دەبین. شتەکە ڕوونە؟

پێویستە ڕێسایەکی زۆر توند و پتەوت هەبێت لەبارەی پچڕاندنی پەیوەندییەکانەوە. ئەمە تەنها قسەی من نییە. دەروونناسێک هەمان شت دەڵێتەوە. قسە لەگەڵ هۆگربوویەکی ماددە بێهۆشکەرەکاندا بکە و لێی بپرسە «پێویستە چی بکەیت تاکو واز لە ماددەی بێهۆشکەر بهێنیت؟» پێت دەڵێت نابێت دەرفەت و ئاسانکاریت بۆ برەخسێت تاکو ئەو ماددەیە بەکار بهێنیت. نابێت و ناتوانیت قومە ئارەق بنۆشیت، ئەگەر دەتەوێت واز لە ئارەق بهێنیت.

بزانە ئەوە پێویستی بە پرۆسەیەکە و سەخت دەبێت، چونکە ئەوە کشانەوە و وازهێنانە. دەتوانیت تێیدا سەرکەوتوو بیت ئەگەر زیان بە ساڕێژبوونی خۆت نەگەیەنیت. بلۆکی بکە، لە هاوڕێیەتی

لای بدە و بیسڕەوە. زۆر توند و پابەند بە لەو کارەدا تاکو نەتوانیت ئەو ماددە بێهۆشکەرە بەکار بهێنیتەوە.

یەکێک لەو خاڵانەی پەیوەستە بە قسەکردنی سەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە، بریتییە لەوەی هەموو ئەو شتانەی ئەو کەسەی بیر دیتەوە تەنها ڤێرژنێکی فۆتۆشۆپی و گۆڕدراون. چەندەها جۆری فلتەر هەن، بۆیە هەموو ئەو شتانەی دەیبینیت لەبارەی ئەم کەسەوە فلتەری لێ دراوە و گۆڕدراوە، جا شێوە و ڕووخساریان بێت، یاخود شێوازی ژیانیان بێت. وێنەی خۆیان بڵاو ناکەنەوە کاتێک لەگەڵ هاوسەرەکەیاندا شەڕ دەکەن. وێنەی ئەو تاقیکردنەوەیەیان بڵاو ناکەنەوە کە تێیدا کەوتوون و شکستیان هێناوە. وێنەی ئەو شتە خراپانە بڵاو ناکەنەوە کە ڕوودەدەن. وێنەی ئەو کاتانە بڵاو ناکەنەوە کە منداڵەکانیان خراپ ڕەفتار و شەڕانین. ئەو وێنانە بڵاو دەکەنەوە کاتێک منداڵەکانیان قورئانی پیرۆز لەبەر دەکەن، کاتێک خۆی و هاوسەرەکەی ڕاوەستاون بۆ وێنەی سێلفی و هەموو شتێک کامل و بێ خەوشە.

لەناو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا ژیانێکی کامل و بێ کەموکورتیت هەس، هاوسەری باشت هەس، ڕووخسار و پێستی ناسک و جوانت هەس، هیچ کەسێک لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان شەڕ ناکات. ئەوە ڕاستەقینە نییە، ئایا ئەوە فێڵکردن و خەڵەتاندنە؟

هەموو ئەو شتانەی دەیانبینی ڕاستەقینە نین، نەک ئەوەی تەنها هۆگربوونەکەت زیاد دەکات، وەلێ زیاتر ئەو شتەی لەناو دەچێت و لەدەست دەچێت، نموونەیی و کامڵتر پێشان دەدات، چونکە هەموو ئەو شتانەی بڵاوی دەکەنەوە، ساختەن و گۆڕدراون و فیلتەر کراون. بۆیە زۆر نموونەیی و کامل دەردەکەون. واز لەوە بهێنە، چونکە ئەوە خودی خۆت لەناو دەبات.

ئامرازێک هەیە یارمەتی مرۆڤەکان دەدات، سارێژ ببن. شتێکە تەنها باوەڕداران هەیانە. جگە لە ئامرازی گەڕانەوە لای پەروەردگار کە پەرجوئاسا سارێژ دەکات، لە پەرتووکی «دڵت بێنەوە»، بەشێک هەیە بە ناوی «کەوتنە خۆشەویستیی شتە ڕاستەقینەکە".

باس لەوە دەکات خێراترین ڕێگا بۆ لەیادکردنی کەسێک، بریتییە لە دۆزینەوەی کەسێکی دی. کەسێک لە یاد دەکەیت، کاتێک کەسێکی باشتر دەدۆزیتەوە. کاتێک شتێکی باشتر دەدۆزیتەوە، دواتر ئاسان دەبێت ئەو شتە لە یاد بکەیت کە لە دەستت داوە، گرنگ نییە چی شتێک بووبێت.

بۆ نموونە منداڵێک ئۆتۆمبێلێکی منداڵانە دەبینێت و ئارەزووی دەکات. خۆشویستن لە یەکەم دیداردا. ئێستا منداڵەکە هۆگری ئەو ئۆتۆمبێلە بووە. هەموو ڕۆژێک داوا لە دایک و باوکی دەکات و دەڵێت: «ئەو ئۆتۆمبێلە منداڵانەیەم دەوێت.» «تکایە ئەو ئۆتۆمبێلەم بدەنێ» بەردەوام تەنها بیر و خەیاڵی لای ئۆتۆمبێلەکەیە. لە کۆتاییدا دایک و باوکی ئۆتۆمبێلەکەی دەدەنێ. ئەوە خۆشترین هەستە لە جیهاندا. هەوڵ بدە ئەو ئۆتۆمبێلە منداڵانەیەی لێ وەربگرەوە. وا بیر دەکاتەوە جیهان کۆتایی پێ هاتووە. ئەی چی ڕوودەدات کاتێک ئەو منداڵە گەورە ببێت و ئۆتۆمبێلێکی ڕاستەقینە ببینێت؟ هۆگرییەکەی بۆ ئۆتۆمبێلە منداڵانەکە چی بەسەردا دێت؟ زۆر ئاسان و سادەیە، ئۆتۆمبێلە منداڵانەکە لە یاد بکات، چونکە شتێکی باشتری بەدی کردووە.

ئەمە یەکێکە لەو ئامرازانەی باوەڕداران هەیانە، بۆچی؟ کاتێک خۆشەویستی پەروەردگار لە دڵ و دەروونماندا دەچەسپێت، کاتێک پەروەردگار و بەدیهێنەرمان دەبێتە خاڵی بنچینەییمان، هۆگرییەکانمان بۆ دروستکراوەکان ئاسانتر و ساناتر لە یاد دەچن ئەگەر پێویست

بێت. چەشنی ئەوەی منداڵەکە ئۆتۆمبێلە منداڵانەکەی لە یاد کرد، چونکە ئۆتۆمبێلێکی ڕاستەقینەی بەدی کرد.

باشترین هۆکاری سارێژبوون بتوانیت ئەنجامی بدەیت، بریتییە لە وابەستەبوونی زیاترت بە پەروەردگارەوە، چونکە بە هیچ چەشنێک پەروەردگار بە دروستکراوەکانی، بەراورد ناکرێت.

ساناترین ڕێگاکانی لەیادکردنی شتەکانی دونیا بریتییە لە خۆشویستنی ژیانێکی باشتر. کاتێک دەکەویتە خۆشەویستی ژیانێکی باشترەوە، کە ژیانی دوایی دەتوانیت واز لە ژیانی ئەم دونیایە بهێنیت، چونکە وەک دەڵێن: ژیانی ئەم دونیایە لەنێو دەستەکانیاندایە و ژیانی ئەو دونیاش لە قووڵایی ناخ و دڵیاندایە.

بۆ نموونە هاوەڵانی پەیامبەرمان(ﷺ)، بەهەشتیان دەبینی و کەوتبوونە خۆشەویستی بەهەشتەوە. بۆیە کاتێک داوایان لێ دەکرا دەستبەرداری سەروەت و سامان و ژیانیشیان ببن و بیکەنە قوربانی، بێ دوودڵی دەیانکرد، بۆچی؟ چونکە شتێکی باشتریان بەدی کردبوو. هۆگربوون و وابەستەبوون بەم دونیایەوە بە شێوەیەکی سروشتی بەرەو لاوازی و کاڵبوونەوە دەچێت.

## وابەستەبوونی یادەوەرییەکان

یەکێک لەو شتانەی سارێژبوونت دوادەخەن، بریتییە لە دەستگرتن بە زۆرێک لەو شتانەوەی کەسێک، یاخود شتێکی لەدەستچوومان بیر دەخەنەوە. کەواتە ئەگەر یادخەرەوەکانی ئەو کەسە، یاخود ئەو شتەی لەدەستمان داوە و بڕی ئەو شتانەی دەستمان پێوە گرتووە زیاتر بێت، چەشنی کەسێک دەبین توێژی سەر برینەکەی هەڵکەنێت.

دەزانیت جەستە پرۆسەیەکی سروشتی سارێژبوونی هەس.

برینێک لە جەستەت دروست دەبێت، چی ڕوودەدات ئەگەر یەکێک بێت لەو کەسانەی بەردەوام توێژی سەر برینەکەی هەڵدەکەنێت؟

چی دەگوزەرێت ئەگەر ئەم ساڕێژبوونە دوابخەیت؟ هەندێک جار ئەمە ڕوودەدات کاتێک بڕێکی زۆر لە یادخەرەوەکان لە دەوری خۆماندا کۆ دەکەینەوە.

هەندێکجار وابەستەی ئەم یادەوەریانە دەبین، چونکە بە نیشانەی دڵسۆزی و وەفای دەزانین. بۆ نموونە لە کاتی مردنی کەسێکدا هەست دەکەین بێوەفا و نادڵسۆزین بۆی، ئەگەر هەندێک لە کەرەستە و شمەکەکانی وەکو یادەوەری هەڵنەگرین. وەلێ لە ڕاستیدا زۆر یادکردنەوە کوشندەیە. چەشنی هەڵکەندنی توێژاڵی سەر برینە. بەهۆی بیرخەرەوە بەردەوامەکانەوە، ناهێڵیت برینەکە ساڕێژ بێت.

کەواتە گرنگە بەشێک لە پرۆسەی ساڕێژبوونەکە بریتیبێت لە دەستبەرداربوونی ئەم شتانە و یادخەرەوانە.

هەندێکجار دەمەوێت لە یادمان بێت ئەگەر دوای تێپەڕینی شەش مانگ درکت کرد هیچ پێشکەوتنێک لە ساڕێژبووندا نییە، ڕەنگە مانای ئەوە بێت هەندێک شت هەن ساڕێژبوونەکەت دوادەخەن. هەروەها ئەمەش لە لایەن دەروونناسانەوە ئاماژەی پێ دراوە. زاراوەیەکیان بۆ ئەم دۆخە هەیە، بەڵام بە گشتی چی دەبێت ئەگەر ئەم پرۆسەی خەمخواردنە لە ڕێڕەوی سەرەکی خۆی لابدات؟

ئەمە مانای ئەوە نییە شەش مانگ تێپەڕیوە و پێویستە ساڕێژ بێت. مانای ئەوەیە کەسێک هیچ بەرەوپێش نەچووە. تەنانەت دوای تێپەڕینی شەش، نۆ یاخود دوازدە مانگ هەر لە هەمان دۆخدان.

بە تێپەڕینی کات پرۆسەی ساڕێژبوونەکە پێویستە بە شێوەیەکی سروشتی بەرەوپێش بچێت، بەڵام ئەگەر شتانێک بکەین

بۆ دواخستنی سارێژبوونەکە، ئەوا هیچ بەرەوپێشچوونێک بەدی ناکەین، هەندێک جار خەڵکی تووشی چەقبەستوویی دەبن.

ئەگەر خۆت لەو دۆخەدا دۆزییەوە، پێویستە لە ناخی خۆت ورد بیتەوە، یاخود هاوکاری دەست بخەیت و درک بەوە بکەیت چی شتانێک هەن بتوانیت لە رەفتارەکانتدا بیگۆڕیت تاکو بەرەوپێش بچیت. درک بەوە بکەیت ئەوە شتێکی باشە لە کۆمەڵگاکەماندا هەمانە. هیچ جێی شەرم نییە لە دەستخستنی یارمەتی و هاوکاریدا، وەلێ شتێکە زۆر بە ڕژدەوە ئامۆژگاریت دەکەم ئەنجامی بدەیت، بۆ کەسێک بدوێ، هاوکاری دەست بخە بۆ سارێژبوون، وەرگرتنی چارەسەر یەکێکە لە باشترین شتەکان بتوانیت ئەنجامی بدەیت، چونکە دەزانین لە ئایینەکەماندا گرتنەبەری هۆکارەکان، یاخود بەستنەوەی وشترەکەمان بەشێکە لە پەرستشەکەمان.

کاتێک کەسێک نەخۆش دەکەوێت، دەڕوات بۆ بینینی پزیشک و وەرگرتنی دەرمان. ئەگەر دەتەوێت پارە و بژێوی ژیان پەیدا بکەیت، بڕۆ و بەدوای پیشەیەکدا بگەڕێ. زانست و زانیاریت دەوێ، بڕۆ بخوێنەوە. شتانێک هەن پێویستە ئەنجامیان بدەین. ئەوە بەشێکە لە بەستنەوەی وشترەکە.

لە کاتی برینیدا، یاخود دڵشکان و لەدەستداندا، هەندێک جار پێویستی بە دەستخستنی چارەسەر، یاخود ڕاوێژە، بزانە ئەوە بەشێکە لە پەرستشەکەمان.



# بەندی چوارەم

## خۆپاراستن چاکترە لە چارەسەکردن

لەم دواییەدا چەند ڕێگەیەک لە کۆمەڵگاکەماندا باوە کە دەبنە هۆی دڵشکانی زیاتر، ئەو ڕێگەیانە چین؟

کوڕێک و کچێک هەن ئارەزووی دۆزینەوەی هاوسەرێک دەکەن، چۆن دەیدۆزنەوە؟ ئەو هۆکارانە چین دەیگرینە بەر بۆ دۆزینەوەی هاوسەری ژیانمان؟

ئێستا دیاردەیەکی بێمانا هەیە، کچان و کوڕان دەست بە قسەکردن دەکەن، یاخود با ناوی بنێین یەکتر ناسین. واتا لە دەرەوەی خێزانەکانیان و دایک و باوکیان، بە تەواوی یەکتری بناسن. تەنها کچە و کوڕە پێکەوە قسە دەکەن. گرفتەکە لەوەدایە ئێستا ئەو دیاردەیە زۆر بەربڵاو بووە. بە مانایەکی تر ئەوانە ڕژد نین و بەدوای هاوسەرگیری ڕاستەقینەدا ناگەڕێن، چونکە لە ئایینەکەماندا هاوسەرگیری تاکە ڕێگەی شەرعی پەیوەندی ڕۆمانسیانەیە. پەیوەندی ڕۆمانسی شەرعیمان نییە جگە لە هاوسەرگیری. ژوان نابەستین.

وادیارە ئێمە ئەم چەمکە لەدەست دەدەین و دەچینە نێو کولتووری ژوانبەستنەوە، بەڵام شێوازی مسوڵمانانە بریتییە لە «تەنها دەمانەوێت یەکتری بناسین، یاخود تەنها هاوڕێین.»[1]

پەروەردگار ژن و پیاوی بە چەند تایبەتمەندییەکی دیاریکراوەوە خوڵقاندووە. ئەو سروشتەش بریتییە لەوەی ئارەزوویەکی سروشتی و فیتری هەیە لەنێوان ژن و پیاودا و ئەو ئارەزووەیش پلاتۆنی[2] نییە. وا نەخوڵقێنراوە پلاتۆنی بێت. ئەگەر پەڕۆیەک ببەستیت بە چاوتەوە و وا خۆت دەربخەیت، ئەو سروشتە ناگۆڕێت کە پەروەردگار خوڵقاندویەتی. ژنان و پیاوان سەرنجڕاکێشانی پلاتۆنیانە نییە لە نێوانیاندا. هاوڕێکەت کە لە ڕەگەزی بەرامبەرە، هاوشێوەی هاوڕێی هاوڕەگەزی خۆت نییە.

گرفتەکەی تر ئەوەیە، کاتێک کەسێکی دی دەناسیت و چەشنی ژوانێکی لێ دێت. کەس لەو نێوەندەدا نییە، کاتێک دەتانەوێت یەکتری بناسن، بە مەبەستی هاوسەرگیری. لە ڕاستیدا ئەم کەسانە تەنها ئارەزووی قسەکردن دەکەن و زۆرێکیان ڕژد نین لە بابەتی هاوسەرگیریدا. ئەگەر کەسێک ڕژد بێت لەبارەی هاوسەرگیرییەوە، ئەوا زۆر زوو دەچنە ناو پرۆسەکەوە. لەبری ئەوە چی ڕوودەدات؟ ماوەیەکی زۆر تێدەپەڕێت و پرۆسەکە بەرەوپێش ناچێت.

نەریتێک هەیە پێویستە بیبووژێنینەوە. کاتێک کەسێک ڕژد دەبێت لە مەسەلەی هاوسەرگیریدا، دەڕۆنە لای باوکی کچەکە. ئەوەش ڕژدی لە مەسەلەی هاوسەرگیری و ڕێز بەرامبەر کچەکە دەردەخات. چوونە لای باوکی کچە مانای ئەوە نییە سبەی مارەی بکەیت،

---

١ - مەبەست لێی موسڵمانان فێری کولتوورێکی هەڵە و ناشەرعی بوون کە بریتییە لە گفتوگۆی زۆر لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا بەبیانووی یەکترناسین، یاخود ڕازیبوون بە هاوڕێیەتی یەکتر.

٢ - پلاتۆنی: خۆشەویستی ڕۆحی.

تەنها مانای ئەوەیە ڕێز لە کچە و خۆت دەگریت. دەریدەخات تەنها کات بەسەر نابەیت و بە مەبەستی قسەکردن و ژوان پەیوەندی نابەستیت.

دەتەوێت ڕێ بگریت لە دڵشکانی زیاتر، بە شێوەیەکی جیاواز بۆی برۆ. ئەگەر کەسێک بۆ ماوەیەکی زۆر قسەی لەگەڵ کردیت و هیچ باسێکی بینینی باوکت و قسەکردن لەگەڵ خێزانەکەتدا نەهاتە گۆڕێ، بزانە ئەوە ئاڵای سوور و ئاگادارکردنەوەیە.

ئەوەی پێویستە بیکەین گەڕانەوەیە بۆ ئەم سنوورانە. بیر لە منداڵێک بکەرەوە لە ماڵێکدایە و ئاگر، پلیکانە، فڕن و زۆپا و چەندین شتی مەترسیدار لە ماڵەکەدایە. چی دەکەیت بۆ پاراستنی ئەو منداڵە؟ بەربەست و سنوور دادەنێیت. پەروەردگاریش هەمان کاری کردووە لەگەڵماندا. چەندین بەربەست و سنووری داناوە تاکو بمانپارێزێت. ئەوە لەپێناوی پەروەردگار و پاراستنیدا نییە، وەلێ بۆ پاراستنی ئێمەیە.

کاتێک پەروەردگار باسی زینا دەکات، بوونی پەیوەندی لە دەرەوەی هاوسەرگیریدا، نافەرموێت: «زینا مەکەن»، بەڵکوو دەفەرموێت: «نزیکی زینا مەکەون.» ئەمەش دوو دەربڕینی تەواو جودان. بە تەنها نافەرموێت مەکەونە نێو تاوانی زیناوە. دەفەرموێت نزیکی زینا مەکەون. بە مانایەکی تر، ئەگەر زۆر نیگەرانی سەلامەتی منداڵەکەم بم، پێی ناڵێم: «برۆ نزیک ئاگرەکەوە یاری بکە، تەنها وریابە نەسووتێی.» بەڵکوو دەڵێم: «مەڕۆ نزیکی ئاگرەکەوە، چونکە دەتسووتێنێت.» پەروەردگاریش بەو چەشنە بە ئێمە دەفەرموێت.

پەروەردگار پێی فەرمووین: «نزیکی ئەو ئاگرە مەکەون»، چونکە دەتانسووتێنێت. چەندین برینی دەروونی و هەستی و دڵشکان هەن کە هیچ پێویست نین و دەکرێت ڕێگریان لێ بکرێت.

ناوچەیەکی بەرفراوانی زینا هەیە کە ناکەویتە تاوانی زیناوە مەگەر سەرەتا نزیکی بکەویتەوە. پەروەردگار سنوور و بەربەستی داناوە بۆ ئەوەی بمانپارێزێت. یەکەمجار سنوورێکی داناوە بە نێوی نزمکردنەوە و داخستنی چاوەکانمان. ناکەویتە نێو تاوانی زیناوە ئەگەر سەرنجەکانت نزم بکەیتەوە و تەماشا نەکەیت. ناکەویتە نێو زیناوە ئەگەر سەرەتا تەماشا نەکەیت. هەموو شتێک لە نیگایەکەوە دەست پێ دەکات.

شێوازی پۆشینی جلوبەرگ و ڕەفتارمان و یاسای پەیوەندی نێوان هەردوو ڕەگەز، ئەمانە سنوور و بەربەستن بۆ پاراستنی ئێمە دانراون.

لە فەرموودەیەکی سەحیحدا پێمان وتراوە، نابێت ژن و پیاو پێکەوە لە خەڵوەتدا بن بە تەنها. هەر کاتێک ژن و پیاوێکی نامەحرەم پێکەوە لە خەڵوەتدا بن، شەیتان سێیەمیان دەبێت.

ناکەویتە نێو تاوانی زیناوە، ئەگەر بە تەنها لەگەڵ نامەحرەمێکدا نەبیت. کەواتە ئەمانە هەموو ئەو هەنگاوانەن کە پەروەردگار دایناوە. وەلێ ئێمە دێین و هەموو سنوور و بەربەستەکان دەبەزێنین. بەم چەشنە دەکەوین و ئەمەش کارێکی گەمژانەیە. پێویستە لە ڕێی پاراستنی سنوور و بەربەستەکانی پەروەردگارەوە، خۆت بپارێزیت.

کاتێک دێتە باسی پەیوەندی دەرەوەی هاوسەرگیری، ئەگەر ئێمە وەک کولتوور ئەم بەربەست و سنوورانە لابدەین، بەهۆی ئەوەوەیە دەسووتێین. پێویستە بگەڕێینەوە و ئەم سنوورانە بنیاد بنێینەوە. هەموو ئەو سنوورانە بۆ پاراستنی خودی خۆمانن.

پێم وایە پێویستە ئەم کولتوورە بگۆڕین. پێویستە بگەڕێینەوە بۆ قسەکردن بۆ وەلی ئەمری کچەکە و باوکی و جدی بین لە مەسەلەی هاوسەرگیریدا.



# بەندی پێنجەم

## ڕەچەتەی

## لەدەستدانی ئازیزێك

جۆرێکی تایبەتی دڵشکان هەس، هاودەم لەگەڵ ڕەچەتەیەک بۆ ئەو جۆرە دڵشکانە. ئەویش ڕوودەدات، کاتێک کەسێک بەهۆی مەرگەوە، لەدەست دەدەیت.

ڕێسایەکی تایبەت هەیە، پەیامبەر موحەممەد(ﷺ)، پێی بەخشیوین. ئافرەتێک هەبوو بە ناوی ئوم سەلەمەوە و مێردەکەی لەدەست دابوو. زۆر هۆگر و ئاشقی مێردەکەی بوو، ئەوان لە دەستەی کۆچکەران بوون. ئوم سەلەمە زۆر دڵشکاو بوو کاتێک مێردەکەی لەدەست دا.

پەیامبەری نازدار نزایەکی تایبەتی فێر کرد، تاکو بیخوێنێت و پێی فەرموو هەرکاتێک ئەم نزایە بکات پەروەردگار شتانێکی باشتری پێ دەبەخشێت.

هەندێک جار کاتێک شتێک بە هاوسەرێکی دڵشکاو دەڵێیت لەبارەی بەدەستهێنانی شتانێکی باشترەوە، ڕەنگە بڵێت: «نەخێر، نامەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ کەسی دیدا بکەم. هیچ کەسێکی باشتر نییە.» ڕەنگە ئەمە ڕاست بێت، بەڵام مانای ئەوە نییە ئەو

شتەی باشتر بێت، پێویستە تەنها مرۆڤ بێت. ئەوەی باشترە ڕەنگە پاداشتێک بێت لەم ژیانەدا، یاخود ڕۆژی دواییدا. ڕەنگە نزیکی بێت لە پەروەردگارەوە. دەکرێت چەندین شت بگرێتەوە. مەرج نییە مانای ئەوە بێت هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی باشتردا دەکەیتەوە. لە نزاکەدا تەنها ئاماژە بە شتێکی باشتر و خێرتر دەکات. مەرج نییە مەبەستی لە هاوسەرێکی دی بێت.

ئەو نزایەی پەیامبەر موحەممەد(ﷺ)، فێری ئوم سەلەمەی کرد، بریتییە لە «إنا لله وإنا إليه راجعون، اللهم آجرني في مصيبتي، وأخلف لي خيرا منها». لە ڕاستیدا هەمووان موڵکی پەروەردگارین و لە کۆتاییدا دەگەڕێینەوە لای ئەو. ئەم وتەیە گشتییە. ڕێگای بینینی جیهانە. پەروەردگار لە سورەتی البقرەدا پێمان دەفەرموێت: «بەڕاستی تاقیتان دەکەینەوە بە ترس، برسێتی، لەدەستدانی سەروەت و سامان، مردن و لەدەستدانی بەرهەمی هەوڵەکانتان.» ئەمانە جۆرەکانی تاقیکردنەوەن و پاشان دەفەرموێت: «مژدە بدەنە ئارامگران».

ئەوەی جێی سەرنجە لەم ئایەتەدا ئەوەیە کەسێک نابینیت پیرۆزبایی لە کەسێکی دی بکات، یاخود مژدەی بداتێ کاتێک دۆست و ئازیزێکی لەدەست داوە. سبحان الله پەروەردگار دەفەرموێت مژدە بدەنە ئەو کەسە. ئەمە شتێکی زۆر سەرنجڕاکێشە. پەروەردگار مژدە دەداتە ئەو کەسانەی دۆست و شتێکی خۆشەویستیان لەدەست داوە.

کێن ئەوانەی ئارامگرن؟ ئایەتی دواتر وەسفیان دەکات. ئەوانەن کاتێک تووشی بەڵا و نەهامەتییەک دێن و دەڵێن: «إنا لله و انا اليه راجعون.» «موڵکی پەروەردگارین و هەر بۆ لای ئەو زاتە دەگەڕێینەوە».

لە ڕاستدا موڵکی پەروەردگارین. ئەمە بەشی یەکەمی تێڕوانینی جیهانە. تێگەیشتنە لەوەی هەموو شتێک بە خۆشەویستان، سەروەرت و سامان، تەندروستیشمانەوە موڵکی پەروەردگارە، نەک موڵکی خۆمان.

هەر بۆ لای پەروەردگار دەگەڕێینەوە. ئایا دەزانیت بۆچی هێندە مانابەخشە تێبگەیت لەوەی هەموو شتێک موڵکی پەروەردگارە؟ تەماشای ئەم نموونەیە بکە: بهێنە پێش چاوت وەکو هاوڕێیەکی بەخشندە دەهێڵم ئۆتۆمبێلەکەم بەکار بهێنیت. پاشان هێندە خۆنەویست و دەست و دڵ کراوەم دەڵێم ئۆتۆمبێلەکە بۆ خۆت هەڵگرە. تۆیش بۆ ماوەی پێنج، یاخود دە ساڵێک ئۆتۆمبێلەکەم بۆ خۆت دەبەیت. دواتر وایدابنێ لە ماوەی ئەو دە ساڵەدا تووشی لەبیرچوونەوە دەبیت و لە یادی دەکەیت ئەو ئۆتۆمبێلە موڵکی منە. وا دەزانیت موڵکی خۆتە. دوای دە ساڵەکە دێم و ئۆتۆمبێلەکەم دەبەمەوە. ئەگەر لە بیرت چووبێت ئەو ئۆتۆمبێلە موڵکی کێیە، وا بزانیت موڵکی خۆتە، هەستت چۆن دەبێت کاتێک دێم بۆ ئەوەی ئۆتۆمبێلەکەم ببەمەوە؟ بەو هۆیەوە تووڕە دەبیت و کاردانەوەی توندت دەبێت.

بۆچی ئەمە ڕوودەدات؟ چونکە لە یادی دەکەیت ئۆتۆمبێلەکە موڵکی کێیە. ئەگەر لە یادت بێت ئۆتۆمبێلەکە موڵکی من بووە و بەئاگا بیت، کاتێک دێم بیبەمەوە، کاردانەوەت چۆن دەبێت؟ «ئەوە موڵکی تۆیە و هەر بۆ خۆت دەگەڕێتەوە.» ڕەنگە دڵتەنگ بیت لێی دابڕێیت، وەلێ بە تەواوی دەزانیت من خاوەنی ئۆتۆمبێلەکەم.

ئەوە «إنا للە و انا الیە راجعون»ـە. تێگەیشتن و درککردنە بەوەی هاوسەر، منداڵ، سەروەت و سامان و تەندروستیت، موڵکی پەروەردگارە و بۆ لای زاتی مەزنی دەگەڕێنەوە.

«اللهم اجرني في مصيبتي». ئەی پەروەردگار پاداشتم بدەرەوە کاتێک لە بەڵا و کارەساتدام. داوا لە پەروەردگار دەکەیت پاداشتت بداتەوە بەهۆی ئەو بەڵا و موسیبەتەی تووشی دێیت و ئارامگریت بەرامبەریان.

«و أخلف لي خيرا منها». شتانێکی باشترم بە خەڵات بکە. بیرت دەخەمەوە ئەوەی باشترە دەکرێت چەند خەڵاتێک و شتانێکی جودا بن. مەترسە لەوەی داوای شتانێکی باشتر لە پەروەردگار بکەیت. مانای ئەوە نییە کاتێک منداڵەکەت لەدەست دەدەیت، منداڵێکی باشترت بە قسمەت ببێت. پەروەردگار شتانێکی باشترت پێ دەبەخشێت، مەرج نییە منداڵ بێت. هەندێک جار ئەو خەڵاتە باشترە لەو دونیادایە. هەندێکجار بەرزبوونەوەی پلەتە لای پەروەردگار و نزیکی لە زاتی مەزنیەوە.

ئەمە ئەو ڕێسایەیە لە لایەن پەیامبەرەوە بۆ ئەو ئافرەتەی خەمبار بوو بەهۆی لەدەستدانی مێردەکەیەوە باس کراوە. بە دڵنیاییەوە ئەمەش بۆ هەموو جۆرە لەدەستدانێک هاوشێوەیە، نەک تەنها لەدەستدانی مێرد. ئەم نزایە ڕەچەتەی هەموو لەدەستدانێکە.

چی ڕوودەدات ئەگەر ئەم نزایە بکەیت؟ پەروەردگار پاداشتت دەداتەوە و شتانی باشترت بە نسیب دەکات. وەکو ئاگادارن لە ژیاننامە و سیرەی پەیامبەردا(ﷺ) باس کراوە ئوم سەلەمە لە کۆتاییدا هاوسەرگیری لەگەڵ پەیامبەری نازداردا(ﷺ) کرد.



# بەندی شەشەم

## ڕەچەتەی دڵێکی شکاو

ڕەچەتەیەکی تر کە دەمەوێت بیخەمە ڕوو، هەمان ئەو ڕەچەتەیەیە کە بەخشیومە بەوانەی باسی پاراستن، زیندوهێشتنەوەی دڵ، چارەسەرە نەبینراوەکانی وەکو چاوپیسی، ئیرەیی و جادووی ڕەش دەکەن، هەروەها هەمان ڕەچەتەیە بۆ سارێژی دڵێکی شکاو.

### یەکەم: نوێژەکانت

دڵنیابەرەوە لەوەی تەواو پابەند و پەیوەستی بە نوێژەکانتەوە. نوێژ چەشنی ئۆکسجینە. جەستە بێ ئۆکسجین سارێژ نابێت. هیچ کام لە ئەندامەکانی جەستەت بێ ئۆکسجین کار ناکەن.

دڵیش بە هەمان چەشنە. پێویستی بە ئۆکسجینی نوێژە. کاتێک دەڵێم نوێژ، مەبەستم لەوە نییە هەرکات ئاسوودە و ئارام بوویت، نوێژ بکەیت. چی ڕوودەدات ئەگەر هەناسە بدەیت هەرکات ئاسوودە و ئارام بوویت؟ بێ هیچ گومانێک دەمریت، چونکە هەناسەدان شتێک نییە جار جار ئەنجام بدرێت، یاخود هەناسە بدەیت هەر کات ئارەزووت بوو.

ئەگەر کەسێک ئۆکسجین وەرنەگرێت، دواتر نابێت لای سەیر بێت جەستەی لەکار بکەوێت. پێویستە چەشنی ئۆکسجینی دڵان لە نوێژ بڕوانین.

هەروەها پێویستە هاوشێوەی بەکارهێنانی دەرمان، لە کات و ساتی خۆیدا ئەنجام بدرێت. ئەگەر پزیشک دەرمانەکەت بۆ بنووسێت و بڵێت پێویستە لەم کاتانەدا بەکار بهێنرێت، تۆیش لەو کاتانەدا بەکاری دێنیت. کات و ساتی بەکارهێنانی دەرمانەکان ناگۆڕیت، چونکە دەرمانەکان بەو شێوەیە چارەسەربەخشن.

پەروەردگار لە هەموو پزیشکان زاناترە. ئەگەر پەروەردگار دەرمانی نوێژت لە چەند کاتێکی دیاریکراودا بۆ دابنێت، لەبەر ئەوەیە خۆی زانایە بەوەی فەرمانی پێ دەکات.

## دووەم: زیکرەکان

بریتین لەو نزا و پاڕانەوانەی پەیامبەر موحەممەد(ﷺ)، ڕۆژانە دەیخوێند. داواتان لێ دەکەم ئەم بەرنامەیە دابگرن: MyDuaa

ئەم بەرنامەیە کۆکراوەی فەرموودە سەحیحەکان و قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانە. تەنانەت ئەگەر ئەم بەرنامەیەش بەکار ناهێنیت و بەرنامەیەکی جودا بەکار دێنیت، گرنگ ئەوەیە بەرنامەیەکی نزات هەبێت و بەکاری بهێنیت.

بۆچی؟ هەموو بەیانییەک کاتێک بەخەبەر دێیتەوە و نوێژی بەیانی لە ساتی خۆیدا ئەنجام دەدەیت، پاشان بەرنامەکە بکەرەوە و بۆ نزاکانی بەیانیان بگەڕێ و بیانخوێنە. لەم بەرنامەیەدا دەتوانیت سندوقی گەنجینە دروست بکەیت کە بەردەوام ڕۆژانە بیخوێنیتەوە. بەردەوام پێوەی پەیوەست بە، تەنانەت ئەگەر بۆ ساتێکی کەمیش بێت، کاریگەرییەکی ئەرێنی زۆر قووڵی لەسەر ژیانت دەبێت.

تاکو زیاتر بەم نزایانەوە پەیوەست بیت، دڵت باشتر و بەهێزتر دەبێت و خێراتر شیفات بۆ دێت.
جاری دواتر پێویستە نزاکانی ئێوارانیش بخوێنیت. ئەمەش ساتی نێوان نوێژی عەسر و نوێژی مەغریب دەگرێتەوە. پاشان خوێندنی نزاکانی شێوانە پێش نوستن. ئەم سێ کاتە سەرەکیترین و گرنگترین ساتەکانی خوێندنی نزا و زیکرەکان.

## سێیەم: قورئانی پیرۆز

قورئانی پیرۆز سارێژکەر و شیفابەخشە. پەروەردگار خۆی ئەمەمان پێ دەفەرموێت. سارێژکەری سینگ و دڵە. دەتەوێت سارێژ بیت؟ پێویستە دەرمانەکە بەکار بهێنیت و قورئانیش دەرمانەکەیە.
بۆیە ئەم سێ شتە هەن: نوێژ (ئۆکسجین)، زیکرەکان (خواردن و خۆراک) و قورئان (سارێژکەر).

# بەندی حەوتەم

## پەروەردگار دەتپارێزێت

نزام وایە پەروەردگار یارمەتیدەر و پشتیوانی هەموو ئەو کەسانە بێت کە ئازار دەچێژن، دڵیان شەقار بووە و ونبوون، بیری خۆم و ئێوەش دەهێنمەوە نابێت هەرگیز هیوا لەدەست بدەن. بە ڕاستی پەروەردگار الجبارە. پەروەردگار سارێژکاری برینە و هەموو برین و شتەکان سارێژ و چاک دەکاتەوە. گرنگ نییە چەندە هەست بە شکاوی بکەیت، یاخود دڵت چەندە شکاو بێت، دڵت سارێژ دەکات. پێویستە باوەڕی تەواوت پێی هەبێت و بزانیت پەروەردگار سارێژت دەکات.

پەروەردگار شتەکان باشتر دەکات تەنانەت باشتر لە پێش شکانیان. بهێڵە دڵەی شکاوت تیمار بکات و سارێژت بکات. پەروەردگار الشافیە، شیفابەخشە. تاکو زیاتر بیناسیت، زیاتر هیوا و ئومێدت دەبێت. تاکو زیاتر بیناسیت، پارێزراوتر دەبیت لە کەوتنە تاریکایی نائومێدییەوە.

پەروەردگار بەڵێنی داوە ئەگەر هانای بۆ بەریت و داوای لێ بکەیت، وەڵامی داواکەت دەداتەوە. ئەو نزیکترە لە مولوولەی خوێنت

لە تۆوە. مولوولەی خوێنت هێڵی ژیانتە. ئەگەر دەتەوێ کۆتایی بە هەر کەسێک، یاخود زیندەوەرێک بهێنیت، بڕۆ بۆ مولوولەکانی خوێنی.

پەروەردگار دەفەرموێت: «کاتێک بەندەکانم پرسیارم دەکەن، پێیان بڵێ نزیکم لێیانەوە. وەڵامی داوای هەر کەسێک دەدەمەوە هانام بۆ بێنێت و داوام لێ بکات».

داوا لە پەروەردگار بکە تیماری دەرد و برینت بکات، پشت بە خۆت مەبەستە، پشت بە هیچ کەس و شتێکی تر مەبەستە تاکو سارێژت بکات جگە لە زاتی مەزنی.

کاتێک لە چیرۆکی هەر یەک لە پەیامبەران ورد دەبینەوە، پەروەردگار هەموویانی پاراست. دەریای بۆ پەیامبەر موسا(ﷺ) شەق کرد. شیفای پەیامبەر ئەیوبی(ﷺ) دا، پەیامبەر یونسی(ﷺ) ڕزگار کرد. ئەمانە تەنها چیرۆکی خۆشی نین، بەڵکوو پەند و وانە و هاندانن بۆمان. کاتێک پەیامبەر ئیبراهیم (ﷺ) هەڵدرایە نێو ئاگرەوە، ئایا پەروەردگار پاراستی؟ تەنانەت کاتێک پەیامبەر ئیبراهیم(ﷺ) تاقی کرایەوە و فەرمانی پێ کرا کوڕە شیرینەکەی سەربڕێت و بیکاتە قوربانی، پەروەردگار خۆی و کوڕەکەی ڕزگار کرد.

کەواتە بزانە و دڵنیابە پەروەردگار ڕزگارت دەکات، تەنها پێویستە بگەڕێیتەوە لای و هیوابڕاو نەبیت.

# بەندی هەشتەم



## کۆتایی

با ساتێک تەرخان بکەین و دەرفەتێک بە خۆمان بدەین. لە سەرەتای ئەم پەرتووکەوە ئاماژەم بەوەدا بە گشتی بیر لە برینی جەستەیی بکەرەوە وەکو شتێکی گرنگ و ڕاستەقینەتر. ئەو ئازارە جەستەییە، تێدەگەین و کات بە خەڵکی دەدەین سارێژ ببن. هاوخەمی زیاترمان هەیە بۆ کەسێکی لاق شکاو بە بەراورد بە کەسێکی دڵشکاو.

دەمەوێت باسی توێژینەوەی سەرنجڕاکێش بکەم لەم بارەیەوە. تاکو خەڵکی بتوانن لەو ئازارە ڕاستەقینەیە تێبگەن کە خەڵکی بە شێوەی جەستەیی و هزری تووشی دەبن.

توێژینەوەیەک ئەنجام درا و تێیدا بەشداربووان و توێژەرەوان (FMRI) یان ئەنجام دا. تەماشای پشکنینی مێشکی بەشداربووەکانیان کرد. حاڵەتگە جودایان دەست کەوت:

ئەو بەشداروبوانەی بەرگەی ئازاری جەستەییان گرتبوو. ئەم بەشداربووانە ئازاری جەستەییان هەبوو و ئەم کارەیان ئەنجام دا بە دانانی بڕێکی زۆری گەرمی لەسەر قۆڵیان. واتە بەڕاستی

ئازاریان هەبوو، چەشنی ئازاری سووتاوی. بەشداربووان پێیان وترابوو ڕێژەی ئازارەکەیان بپێون و پێوەرێکی ١ تاکو ١٠ی هەبوو، کە ژمارە ١٠ ئازارێکی بەرگەنەگیراو بوو.

پاشان ئەو بەشداربووانە تەماشای وێنەی ئەو کەسەیان کرد کە دڵیانی شکاندبوو و ئەو یادەوەرییەیان ژیاندەوە. دەزانیت چییان بۆ ئاشکرا بوو؟ بۆیان دەرکەوت پشکنینی مێشکەکە هاوشێوەی ئەو بەشداربووانە بوو کە تووشی ئازای جەستەیی ببوون بە ڕێژەی ٨ لە ١٠. ئەمەش چەشنی ئازارێکی بەرگەنەگیراوی جەستەییە. پشکنینی مێشکەکە ئەوەی دەرخست.

دەزانیت ئەمە مانای چییە؟ مانای ئەوەیە ئازاری هەستەکان چەشنی ئازاری جەستەیی کار دەکاتە سەر مێشک. نەک هەر ئازارێکی جەستەیی سادە، بەڵکوو ئازارێکی زۆر سەخت و بەرگەنەگیراو. بۆیە ڕاستییەکە ئەوەیە شتێکی نەبینراوە و ڕاستەقینەیە. تەنها شتێک نییە خەڵکی خەیاڵی بکات. کاریگەری جەستەیی هەیە.

لە توێژینەوەیەکی تردا بۆیان دەرکەوت کاتێک کەسێکی نێو بەشداربووان بیری لە لەدەستدانی کەسێکی ئازیز و خۆشەویستی دەکردەوە، لە ڕاستیدا کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لە کەمبوونەوە و دابەزینی ئاستی زیرەکییان. ئاستی زیرەکییان دابەزی تەنها بە بیرکردنەوە لە کەسێک کە خۆشیان دەویست. بەو ڕادەیە کاریگەری هەبوو لەسەر کەسەکە. چەندین توێژینەوەی تر هەن باس لە کاریگەرییە زۆرەکەی دڵێکی شکاو دەکەن، نەک تەنها لەسەر توانای هزری، بەڵکوو لەسەر گەشەسەندنی جەستەییش.

ئەگەر کەسێک بهێنیتە خەیاڵت کە بیر لە لەدەستدانی کەسێکی خۆشەویستی دەکاتەوە و ئاستی زیرەکی و توانای بیرکردنەوەیان

کەم دەبێتەوە، کەواتە دەتوانیت بهێنیتە پێش چاو ئەگەر بەڕاستی تووشی ئەو چەشنە لەدەستدانە ببیت، چەندە کارت تێ بکات؟ کەچی هێشتا چاوەڕوان دەکەین ئەو کەسانە بە هەمان شێوە کار بکەن و هەمان تەرکیزیان هەبێت لەسەر کار و ژیانی ڕۆژانەیان. نابێت بەو شێوەیە بیر بکەینەوە، چونکە لەنێو هزر و ناخ و دڵی ئەو کەسەدا ئەو گۆڕانکاریانە ڕوودەدات.

بۆیە زۆر گرنگە تێبگەیت کاتێک باس لەمە دەکەین. دەرئەنجامی نابەرجەستەیی لەسەر هزر و لاشەمان هەیە. ئەوە هۆکاری سەرەکی باسکردنی سارێژبوونە.

# لەدایکبوونەوە



لە تەمەنی سێزدە ساڵییەوە دەستم بە پۆشینی حیجاب کرد. لە ڕۆژێکی هاویندا بۆ گەشتێکی خوێندنگا ڕۆیشتم، کاتێک قۆناغی هەشتەمم تەواو کردبوو و دەرچووبووم بۆ قۆناغی نۆیەم، لە کۆتایی گەشتەکەدا هەستم کرد پێویستە ژیانی خۆم بگۆڕم. دەمویست زیاتر پابەندی ئاینی ئیسلام بم. لەو ساتەدا دوو بڕیاری گرنگ و بنچینەییم دا:

**یەکەم/** بڕیارم دا بە تەواوی پەیوەست بم بە کات و ساتی نوێژەکانمەوە و کەمتەرخەمیان تێدا نەکەم، چونکە هاوشێوەی هاوتەمەنەکانی خۆم زۆر جار نوێژەکانم دوادەخست، یاخود نەمدەکرد. بۆیە بڕیارم دا ئیدی لە ئەنجامدانی نوێژەکانمدا کەمتەرخەمی نەکەم.

**دووەم/** بڕیارم دا حیجاب بپۆشم پێش ئەوەی قۆناغی خوێندنی دواترم دەست پێ بکەمەوە و بچمە قۆناغی ئامادەیی. حیجاب لای من زۆر شت دەگەیەنێت. شتێکە ئێستا بەشێکە لە ناسنامەم. لە هەمووی گرنگتر، حیجاب بە لای منەوە هێمای خۆشەویستی پەروەردگارە. هەروەها پابەندبوونمە بەو ڕاستییەی نابێت منی ئافرەت وەکو کاڵایەک تەماشا بکرێم. لەنێو کۆمەڵگە و بانگەشە و

ڕاگەیاندنەکاندا زۆر جار ئافرەت وەکو کاڵایەک تەماشا دەکرێت. حیجاب هێمای شکۆ و هێز و پەیوەندیمە لەگەڵ خالقی خۆمدا. بۆ خۆدەرخستن وەک لاشەیەک دروست نەبووم، بەڵکوو ئەوەی گرنگە ناخ و ڕۆحمە. بۆیە بڕیارم دا پەروەردگارم بخەمە پێش هەموو ئامانجێکمەوە، ئەوەی بە لای پەروەردگارمەوە چاک و جوانە گرنگتر و باڵاترە لە لام لەوەی بە لای کۆمەڵگە و دروستکراوەکانیەوە چاک و جوانە. هۆکاری پۆشینی حیجاب لە یەکەمجاردا هەمان ئەو هۆکارەیە کە ئێستاش دەیپۆشم. کاتێک بە دایکمم وت، ئیتر من حیجاب دەپۆشم، یەکەمین کاردانەوەی بریتی بوو لە «من هیچ زۆرت لێ ناکەم حیجاب بپۆشیت.» وەڵامم دایەوە، دەزانم دایکە گیان، بەڵام خۆم دەمەوێت حیجاب بپۆشم. ئەوە بڕیاری تایبەتی خۆم بوو و هیچ کەسێک ناچاری نەکردم بە پۆشینی. بڕیارێک بوو ڕاستەوخۆ لە قووڵایی ناخمەوە دام، چونکە بڕوام وابوو ئەمە ڕێگا ڕاستەکەمە بەرەو پەروەردگار و ئێستایش هەمان بۆچوونم هەیە. کاتێک لە ناخەوە بە تەواوی جێگیر و پتەو دەبیت، خەڵکیش هەست بەوە دەکەن کە بڕوابەخۆ و بەهێزیت لەو کارانەی ئەنجامی دەدەیت و ئەو شتانەی باوەڕت پێی هەیە. پێویستە بە تەواوی پابەندی بیروباوەڕەکەمان بین. بەم شێوەیە هەمووان ڕێزت دەگرن. پەیوەندییەکی زۆر بەهێز هەیە لەنێوان نوێژەکانمان و هەموو شتەکانی ژیانمانەوە بە حیجابیشەوە. ئامۆژگاریم بۆ ئەو ئافرەتانەی دەیانەوێت حیجاب بپۆشن، یاخود وازی لێ بهێنن، بریتییە لەوەی بناغەی خۆیان لەگەڵ پەروەردگاریاندا بەهێز بکەن، لە ڕێی بەهێزکردنی پەیوەندییان لەگەڵ نوێژەکانیاندا. ئەگەر مرۆڤ پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ نوێژەکانیدا هەبێت، هەموو شتەکانی تر سادە و ئاسان دەبن بۆی. ئەوە بنەمایەکی سەرەکییە کە

فێری بووم و بە کەسانی تریشی ڕادەگەیەنم. حیجاب نیشانەی پەیوەندیمانە لەگەڵ پەروەردگاردا. هۆکاری سەرەکی پۆشینی حیجاب بریتییە لەوەی پەروەردگار فەرمانی پێ کردووین و دەبێت ملکەچی فەرمانی ئیلاهی بین. دەکرێت چەندین هۆکاری تر ئاماژە پێ بدرێت بۆ پۆشینی حیجاب. بۆ نموونە، بە پۆشینی حیجاب بەرپەرچی ئەوە دەدەمەوە وەک کاڵایەک تەماشا بکرێم. زۆر جار کەسانێک دەیانەوێت واز لە حیجاب بهێنن و دێن داوای ئامۆژگاریم لێ دەکەن. ئامۆژگاریان دەکەم بەوەی بگەڕێنەوە بۆ خاڵی بنەڕەت کە پەیوەندییانە لەگەڵ پەروەردگار، ئەویش بە تایبەت لە ڕێی ئەنجامدانی نوێژەکانەوە. بە وابەستەبوون و گرنگیدان بە نوێژەکان هەموو کارێکی تر ئاسان دەبێت، جا پۆشینی حیجاب بێت، یاخود جۆرەکانی تری پەرستشی ئیلاهی.

## چۆن پەروەردگار بناسین؟



زۆر کەس بە شێوەیەکی دروست نازانن پەروەردگار کێیە. زۆرێکمان چۆن بیر لە دراوسێ و کەسانی تر دەکەینەوە، ئاوایش بیر لە پەروەردگار دەکەینەوە. زۆر کەس پێویستە ئەو چەمک و شتانەی لەبارەی پەروەردگارەوە فێری بوون و لەگەڵیاندا گەورەبوون، لە بیری خۆیان ببەنەوە. یەکێک لەو هەڵە کوشندانەی زۆرێکمان لەگەڵیدا گەورەبووین، وا تێگەیشتووین پەروەردگار هاوشێوەی پۆلیسێکە، چاوەڕێیە بتخاتە بەندیخانەیەکەوە، ئەو بەندیخانەیەش پێی دەوترێت دۆزەخ. یەکەمین ئەو وشانەی لە سەرەتاوە لە بارەی ئیسلامەوە فێریان دەبین، بریتین لە حەرام و دۆزەخ، بە چەشنێک ئەو منداڵە بچووکانەی زۆر شت نازانن، حەرام و دۆزەخ دەزانن.

ئەم چەمکانە هەر لە منداڵییەوە فێری منداڵەکانمان دەکرێن، واتا هەر لە سەرەتاوە فێر دەکرێت ئیسلام چەند شتێکە کە ناتوانیت ئەنجامی بدەیت و بە هۆیەوە سزا دەدرێیت. هەندێ شتیش هەن دەتوانیت ئەنجامیان بدەیت، وەلێ ئەوانەی حەرامن و ناتوانیت ئەنجامیان بدەیت، زیاترن. ڕاستە ئیسلام چەند شتێکی هەیە، بۆنموونە: حەرامە ئەمە بخۆیت، ئەوە بپۆشیت و بەو شێوەیە ڕەفتار بکەیت. لە کاتێکدا هەموو ئەم شتانە لە ژیاندا گرنگ و پێویستن.

پێویستمان بە یاسایە بۆ شۆفێریکردن، چی دەبوو ئەگەر هێماکانی هاتوچۆ نەبوونایە؟ گڵۆپی سوور و سەوز نەبوونایە؟ ئەوکات هیچ هێمایەکی وەستان نەدەبوو. پێویستمان بە یاسایە، وەلێ شتێکی زۆر گرنگ هەیە باس نەکراوە. تێگەیشتنێکی هەڵەمان لەبارەی پەروەردگار و بەدیهێنەرمانەوە هەیە، هیچ پەیوەندییەکی نزیکمان لەگەڵ پەروەردگارماندا نییە، بۆچی بەو چەشنەیە؟ چونکە زۆرێکمان گەورەبووین و هاوشێوەی پۆلیسێک بیرمان لە پەروەردگار کردۆتەوە. بەڕاستی ئەمە کارەساتێکی کوشندەیە. ڕەنگە بپرسین بۆچی گەنجان نایەن بۆ مزگەوت؟ بۆچی زۆرێک لە گەنجان واز لە ئیسلام دێنن؟ هۆکارێک هەیە بۆ ئەمە، پەروەردگار خۆی گەنجانمان بپارێزێت، زۆر کەس بنەما دروست و ڕاستەکان و پەیوەستەکانیان بە پەروەردگارەوە فێر ناکرێت، چونکە ئایینیان وەک لیستێک فێر کراوە، وەکو لیستێک لە شتی حەرام و حەلاڵ.

وای دابنێ منداڵێکت هەیە و هەموو ڕۆژێک بە منداڵەکەت دەڵێیت: پێویستە ئاگاداری پۆلیس بیت، ئەگەر بچووکترین هەڵە بکەیت، دێت و دەستگیرت دەکات و دەتخاتە نێو بەندیخانەوە. هەموو ڕۆژێک ئەمە بە گوێیدا دەدەیت: پێویستە ئاگادار بیت پۆلیسەکە چەکی پێیە. کاتێک منداڵەکە گەورە دەبێت چی ڕوودەدات؟ ئەو منداڵە چ جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ پۆلیسدا دەبێت؟ ئایا ئەو منداڵە پۆلیس ببینێت دەڵێت، با تۆزێک لێی نزیکتر ببمەوە؟ دەمەوێت ببمە هاوڕێ لەگەڵیدا تاکو پێویستی و هەستەکانمی بۆ دەرببڕم؟ نەخێر لە ڕاستیدا منداڵەکە دەیەوێت لە پۆلیسەکە دوور بێت و هەڵبێت. شتەکە ڕوونە؟ ئەگەر پۆلیس لەم ڕێگایەدا بێت، ئەو بە ڕێگایەکی تردا دەڕوات. ئایا ئەو منداڵە پۆلیسی خۆش دەوێت؟ نەخێر، منداڵەکە لێی دەترسێت، تێدەگەن؟

بۆیە زۆرێک لە ئێمە بەو جۆرە پەیوەندییە لەگەڵ پەروەردگاردا گەورە دەبین، لێی دەترسین، وەلێ جۆرە ترسێکی هەڵە و مەترسیدار. ئەمە مانای چییە؟ لە پەروەردگار بترسە. ئەمە گرنگە، بەڵام ترس لە پەروەردگار بە شێوەیەکی گونجاو و دروست چییە و چۆنە؟ ئەمە جۆرێکی دروستی ترس نییە، چونکە ترسێکی دروست لێی وات لێ دەکات زیاتر بەرەو ئەو هەنگاو بنێیت. ئەمەش پێی دەوترێت پەرستشێکی دروست، ترسێکی دروست، تەقوا و پەرستش و ئاگاداربوون لە پەروەردگار. ئێستا دەزانیت چی ترس و تەقوایەک هانت دەدات زیاتر بەرەو لای پەروەردگار بڕۆیت و هەنگاو بنێیت؟ دەتەوێت زیاتر لێی نزیک ببیتەوە؟ وەک ئەوەیە لە ترسی پەروەردگاردا بەرەو پەروەردگار هەنگاو بنێیت، ئەمە مانای چییە؟ واتا ڕاکردن و دوورکەوتنەوە لە تووڕەیی و غەزەب و سزا و ناڕازیبوونی پەروەردگار، لە ڕێی هەنگاونان و نزیکبوونەوە لێیەوە، نەوەک دوورکەوتنەوە لێی. ئەگەر زانیت لە پەروەردگار دوور دەکەویتەوە و ڕادەکەیت لێی، وەک ئەوەی بەسەر گەنجەکانماندا هاتووە؛ نامەوێت چیدی بچمە مزگەوت، نامەوێت چیدی پابەندی ئایین بم، ئەوە ترسێکی دروست نییە، بەڵکوو نادروست و خراپە کە لە منداڵییەوە تێیاندا ڕەگی داکوتاوە.

هاوشێوەی ترسی منداڵەکە لە پۆلیس وایە. کەسەکە دەیەوێت لە پەروەردگار دوور بکەوێتەوە، بۆچی؟ چونکە دەڵێت: هەر هەڵەیەک بکەم دەچمە دۆزەخەوە. گوێت لە شتی نەفامانە دەبێت، پێویستە ئەم جۆرە بیرکردنەوانە بگۆڕدرێن و لەبیر بکرێن، بۆچی؟ چونکە ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار لە پێش غەزەب و تووڕەییەکەیەوەیەتی. پەروەردگار چەشنی پۆلیسێک نییە بیەوێت بمانخاتە بەندیخانەوە، بەڵکو لە دایکێک بۆ منداڵەکەی بەڕەحمتر و میهرەبانترە بۆمان.

دەمەوێت ساتێک لەوە ڕابمێنن و بزانن مانای چییە. دەمەوێت بیر بکەنەوە دایکێک لەپێناو پاراستنی منداڵەکەیدا چی بۆ دەکات؟ دواتر بیر لە پەروەردگار بکەنەوە. ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار زۆر لەوە زیاترە، ڕەحم و بەزەییەکەی سەرچاوە و کانیاوی هەموو ڕەحم و بەزەییەکانی ترە. پەروەردگار چاوەڕێی ئەوە نییە بمانخاتە نێو ئاگری دۆزەخەوە، وەلێ دەیەوێت و شەیدایە لێمان خۆش ببێت. دەیەوێت ڕەحمی خۆیمان بەسەردا برێژێت. زۆر شت هەن دەبێت لە بیری خۆمانی بەرینەوە، تاکو تێبگەین پەروەردگار کێیە، چونکە دواتر دەبێتە هۆی تێگەیشتنمان لە هەموو ئەو شتانەی لە ژیاندا بۆمان پێش دێن. ئەگەر بیر لە پەروەردگار بکەیتەوە، کە تووڕەیە و چاوەڕێیە هەڵەیەک بکەیت. کاتێک هەڵەیەک دەکەیت دەکەویتە نائومێدییەکی کوشندەوە، چونکە وا تێگەیشتووی پەروەردگار ڕقی لێتە، یاخود سزات دەدات. ئەمە ئەو چەشنە تێگەیشتنانەیە کاتێک هەڵەیەک دەکەیت، لەبارەی پەروەردگارەوە چەند چەمکێکی نەرێنیانەت لا دروست دەبێت. ئەو چەمکە نەرێنیانە دەبنە مایەی نائومێدیت.

## گومانی باشبردن بە پەروەردگار



یەکێک لە ئامرازە گرنگەکان، کە دەتوانین لەم نەخشە ڕێگایەدا سوودی لێ وەرگرین، پێی دەوترێت گومانی باشبردن بە پەروەردگار (حسن الظن بالله). واتا بیرکردنەوەیەکی ئەرێنیمان بەرامبەر بە پەروەردگار هەبێت. دەبێت ئەو شتە لە بنچینەوە بگۆڕین. زۆرێکمان بیرکردنەوەی نەرێنیمان بەرامبەر پەروەردگار هەیە و وەکو سەرچاوە و کانگای هەموو ڕەحم و میهرەبانییەکان بیر لە پەروەردگار ناکەینەوە. وا بیر دەکەینەوە، پەروەردگار چاوەڕێیە هەڵەیەک بکەین و بمانخاتە ئاگری دۆزەخەوە. پەروەردگار بەو شێوەیە نییە. پێویستە ئەو بیرکردنەوەیە لە بیر خۆمان بەرینەوە. بەداخەوە زۆرێکمان بەو شێوەیە فێر کراوین و پەروەردە کراوین. هەندێکمان ئەوە بۆ کۆنترۆڵکردنی منداڵەکانمان بەکار دێنین، بەڵام بەداخەوە ڕێگایەکی خراپە. تەنانەت ڕەنگە کەسێک ئیمان و باوەڕ لە دڵیدا جێگیر نەبێت و بە ڕووکەش مسوڵمان بێت. ڕەنگە هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بێت. زوو کۆتایی دێت و لەناو دەچێت، ئەگەر لە ناخەوە نەبێت، چەشنی جلوبەرگ لەبەر دادەکەنرێت، بە تایبەت کاتێک کەسەکە دەکەوێتە نێو تاقیکردنەوەیەکی سەختەوە. ئەو جۆرە تاقیکردنەوانە چین کە ڕەنگە پێیدا تێپەڕێت؟ هەندێک

کەس بە ڕۆیشتن بۆ زانکۆ و کۆلێژ و جێهێشتنی ئەو ژینەگەیە و ڕۆیشتن بۆ ژینگەیەکی تر تاقی دەکرێنەوە. ڕەنگە زانکۆ جێبهێڵێت و فریو بخوات، ئەگەر ئیمان و باوەڕەکەی لە ناخ و دڵدا جێگیر نەبووبێت. بەرگەی ئەم زریان و تاقیکردنەوانە ناگرێت.

زۆر گرنگە یەکەم شت تێگەیشتنێکی دروستمان لەبارەی پەروەردگارەوە هەبێت و گومانی باشی پێ ببەین. تێگەیشتنێکی ئەرێنیمان هەبێت لەبارەیەوە و ئەو تێگەیشتن و پەیوەستیەش پێویستە لە ناخەوە بێت، نەک تەنها لەسەر ڕووکار و پۆشاکمان ڕەنگ بداتەوە. قورئان دەکرێت بە ڕێکی و جوانی بخوێنرێتەوە، وەلێ ئەگەر کاریگەری لەسەر دڵەکان جێنەهێڵێت، ئەوە ئامانج و مەبەستی ڕاستەقینەی خۆی نەپێکاوە. کاتێک مانگی ڕەمەزان دێت و قورئانێکی زۆر دەخوێنینەوە، ڕەنگە چەند جارێک خەتمی بکەین، بەڵام نەمانگۆڕێت. ئایا لەوە تێدەگەین کە دەیخوێنینەوە؟ ئایا دەچێتە دڵەکانمانەوە، یاخود تەنها بە ڕووکەشە؟ زۆر گرنگە بچێتە قووڵایی ناخەوە.

پێویستە بیرکردنەوەیەکی ئەرێنیمان هەبێت لەبارەی پەروەردگارەوە. بیرکردنەوەی ئەرێنی لەبارەی پەروەردگارەوە چۆنە؟ با نموونەیەکتان بۆ بهێنمەوە. کاتێک دایکێک، یاخود باوکێک منداڵەکەی دەبات بۆ ئەوەی دەرزی لێ بدات. زۆرێکمان ئەزموونی ئەمەمان کردووە، ڕەنگە منداڵێک بووبێت و بردرابێت دەرزیت لێ بدرێت، یاخود دایکێک، یاخود باوکێک بوویت و منداڵەکەت بردبێت. هەموومان دەزانین شتێکی خۆش نییە، بەڵام مەبەست و ئامانجێکی هەیە. کاتێک دایکەکە منداڵەکە دەبات بۆ کوتان، شتێکی بەئازارە، وەلێ ئەو دایکە بۆ سوود و بەرژەوەندی منداڵەکەی دەرزی لێ دەدات. گومانی باشبردن لەم نموونەیەدا ئەوەیە وەک منداڵێک

گومانی باش بە دایک، یاخود باوکت دەبەیت. دەزانیت دایک و باوکت بەرژەوەندی و سوودی تۆیان دەوێت، نەک ئەوەی ئازارت بدەن. متمانەت بە دایبابت هەیە و بیرکردنەوەیەکی ئەرێنیت لە بارەیانەوە هەیە. کاتێک دایبابت دەتخەنە حاڵەتێکی ئازاربەخشەوە، دەزانیت و دڵنیایت ئەوە بۆ چاکە و سوودی خۆتە، دەزانیت کوتانەکە بۆ سوودی خۆتە و گومانی خراپت بەرامبەر دایبابت نییە. گومان ناکەیت بیانەوێت بتکوژن، یاخود بیانەوێت بە دەرزییەکە ژەهراویت بکەن. وا بیر ناکەیتەوە بیانەوێت ئازارت بدەن، دەزانیت ئەوە بۆ سوود و قازانجی خۆتە. گومانی باشبردن بە پەروەردگار بریتییە لەوەی دڵنیا بیت هەر کارێک بکات بۆ سوود و قازانجی خۆتە، تەنانەت ئەگەر بکەویت و ماندوو بیت، لە کۆتاییدا پەروەردگار چاکە و خێری تۆی دەوێت و خراپە و زەرەری تۆی ناوێت. ئەوە گومانی باشبردنە بە پەروەردگار.

## هاوسەرگیری بۆ دۆڕاوەکانە



«بە دڵی خۆت بکە و بە سەڵتی بمێنەوە، یاخود هاوسەرگیری بکە: خۆت هەڵی بژێرە.» بیرم نایاتەوە کێ پێی وتم، وەلێ لە یادمە بە نیمچە گاڵتەیەکەوە پێیان وتم، وەلێ نیمچە ڕاستییەکە زۆر گرنگە. بۆیە زۆرێک لە چارەسەرکاران پەرۆش نین لە چارەسەرکردنی گرفتی هاوسەرگیریدا. گرفتێکی زۆر ئاڵۆز و نارەحەتە و زۆر جار لە دەست دەردەچێت. لە خراپترین دۆخەکاندا چارەسەرکار لە بەشی پێشەوەی ململانێکەدایە، وەلێ من ئارەزووی چارەسەری گرفتەکانی هاوسەرگیری دەکەم، بۆچی؟ ڕەنگە ئارەزووم لە کارەکە هەبێت، چونکە ڕێسایەک لە مێشکمدایە: ئەگەر هاوسەرگیری سەرکەوتوو بێت، پێویستە چەشنی کێبڕکێیەک بێت، تاکو بزانرێت کام لە هاوسەران زیاتر دەدۆڕێت و کێبڕکێیەک بێت، تاکو کۆتایی ئەنجامەکە نەزانراو بێت.

کاتێک دێتە باسی بردنەوە و دۆڕان، بڕوام وایە سێ جۆر لە هاوسەرگیری هەن. لە جۆری یەکەمدا هەردوو ژن و مێرد هەوڵی بردنەوە دەدەن و جەنگێکی سەختە. ژن و مێرد چەکی زۆر و کوشندەیان پێیە، هەر لە مستەکۆڵە و قسەوە بگرە تاکو بێدەنگی. ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە لەناو دەچێت و هەڵدەوەشێتەوە. ژن و

مێرد یەکتری لەناو دەبەن و یەکتری تێکدەشکێنن، لە ئەنجامدا ئاشتی و ئارامی منداڵەکانیان تێک دەدەن. لە ڕاستیدا هەڵوەشانەوەکە سوودی زیاترە، بە جۆرێک توێژینەوەکان پێمان دەڵێن بۆ منداڵ باشترێکە دایک و باوکیان جیا ببنەوە نەک بەردەوام لە شەڕ و ناکۆکیدا بن. ئەم هاوسەرگیریانە بەرپرسن لە شکستی (٥٠٪)ـی هاوسەرگیرییەکان. جۆری دووەمیان پڕە لە بردنەوە و دۆڕان، بەڵام ڕۆڵەکان جێگیرن، هەمیشە هەمان ژن، یاخود مێرد دۆڕاوە. ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە هاوسەرگیری چەوساوەیە. واتا هەمیشە یەکێکیان زاڵ دەبێت و ئەوی تریان چەوساوە و ژێردەستە. لە ئەنجامدا هەردووکیان ڕێز و شکۆیان لە دەست دەدەن. ئەمەش هاوسەرگیری ئالوودەبووان، بەردەستە، زاڵمان و کۆیلەکانە. ڕەنگە خەمناکترین جۆری هاوسەرگیری بێت.

جۆری سێیەمی هاوسەرگیری هەیە. ئەم جۆرە کامڵ و بێ کەموکورتی نییە، وەلێ ژن و مێرد بڕیاریان داوە یەکتریان خۆش بوێت و لەپێناو یەکتردا، قوربانی بدەن. لەم جۆرە هاوسەرگیرییەدا دۆڕان دەبێتە جۆرێکی ژیان و کێبڕکێیەک بۆ زانینی ئەوەی کێ دەتوانێت زیاتر گوێ لەوی تر بگرێت، گرنگی پێ بدات، خزمەتی بکات، بیبەخشێت و قبووڵی بکات.

هاوسەرگیرییەکە دەبێتە کێبڕکێیەک بۆ زانینی ئەوەی کێ دەتوانێت بە چەشنێک بگۆڕێت، هاوکار و یارمەتیدەری زیاتری بەرامبەر بێت، لە خۆی ببوورێت لەپێناو زیادکردنی شکۆ و ڕێز و هێزی بەرامبەر. ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە ئەو کەسانە دروست دەکات، کە دەتوانن بچووک، سادە، بەبەزەیی، دڵنەرم و ئاشتەوا بن.

بە مانایەکی تر ئەمانە شۆڕشگێڕن، چونکە لە کولتوورێکدا دەژین دۆڕان دوژمنمانە. بەیانیان بەئاگا دێینەوە بە هەواڵی

تێکچوونی ناکۆکییەکان. دەچینە سەر کار، هەمووان تێیدا دەجەنگن بۆ سوود و بەرژەوەندی بەڕێوەبەر و پلەبەرزبوونەوە. یاخود لە ماڵەوە دەمێنینەوە کە تێیدا ناکۆکی و ململانێ لەسەر یاریی منداڵان زیاترە. لە شەوانیشدا گوێ لە دەمەقاڵێی بەرنامەکان دەگرین و هەریەک لە میوانەکانی بەرنامەکە دەیەوێت بۆچوونەکەی خۆی براوە بێت. دەجەنگین بۆ ئەوەی باشترین شمەکمان هەبێت و لە باشترین براندەکان بین. کاتێک لە کۆتایی ڕۆژدا یەکتر دەبینین دەجەنگین، چونکە بە هیچ شتێکی تر ڕانەهێنراوین. لە خراپترین دۆخدا پەروەردە کراوین بۆ جەنگان لەپێناو ڕزگاربوونمان لە ڕووی جەستەیی و هەستییەوە. لە باشترین دۆخدا بۆمان دەردەکەوێت هەوڵی بردنەوەی پێشبڕکێکە دەدەین لەپێناو بەدەستهێنانی سەرنج و پەسەندکردنی دایک و باوکمان و هاوڕێیانمان. بەم چەشنە چوونە هاوسەرگیرییەکەوە کە تێیدا دۆڕان نەریتی هاوبەشی ژن و مێردە، دەبێتە کارێکی دژە کولتوور. بۆ ئەوەی لە ژووری چارەسەری هاوسەرگیریدا دانیشیت، پێویستە یاخیبوون بەرپا بکەیت.

هاوسەرگیری یاخی چۆنە؟ لەم دواییەدا کاتێک خوێنم قوڵپ دەدات و دەزانم فەرامۆش کراوم و هەڵە لێم تێگەیشتون و ئامادەم هەموو شتێک بکەم بۆ ڕازیکردن و بردنەوەی ئەوەی شایستەمە، هەوڵ دەدەم پەیوەندییەکی تەلەفونیم بێتەوە یاد، کە لە لایەن مامۆستای کوڕەکەمەوە پێمانەوە کرا. ڕۆژێک دوای قوتابخانە پەیوەندی پێوە کردین تاکو پێمان بڵێت ڕووداوێک لە وانەی جومناستیک ڕوویداوە. دوای پێشبڕکێیەکی وەرزشی توند، کە خەڵاتەکەی بریتی بوو لە زوو چوونە دەرەوە و جێهێشتنی پۆل. تیمی کوڕەکەم دۆڕا. دۆڕاوەکان وەستابوون و مینگەیان دەهات و سکاڵای جۆری نادادپەروەرییان دەکرد کاتێک براوەکان چوونە

دەرەوە. کوڕەکەم دەستی بە چەپڵەلێدان کرد. چەپڵەی بۆ براوەکان لێ دەدا و خەندە بە ڕووخسارییەوە بوو، کاتێک دەڕۆیشتنە دەرەوە. مامۆستای جومناستیک بە خێرایی هانی تەواوی تیمەکەی دا وەکو ئەو بکەنەوە. دۆڕاوەکانی پۆلی دووەم چەپڵەیەکی توندیان بۆ هاوپۆلە براوەکانیان لێدا و بەوەش دانیان بەوەدا نا کە دۆڕاون. کاتێک تووڕە دەبم، هەوڵ دەدەم دڵی کوڕەکەی خۆمم بێتەوە یاد. دڵێک بە شانازییەوە دەدۆڕێت و ئامێز بۆ براوەکان دەکاتەوە.

لە هاوسەرگیریدا دۆڕان واتە چاککردنەوەی هەموو شتێک بۆ هاوسەرەکەت و گوێگرتن لە نەهامەتییەکانیان و دڵت بۆیان ژان بکات. هاوبەشیکردنە لە ساتە پڕ ئازارەکاندا زیاتر لە ساتە خۆشەکان. بریتییە لە دۆزینەوەی ڕێگا بۆ خاکیبوون و کرانەوە، تەنانەت کاتێک هەموو ئاماژەکان لە تۆدا پێت دەڵێن ڕاستیت و ئەوان هەڵەن. بریتییە لە ئەنجامدانی ئەو کارەی ڕاست و چاکە بۆ هاوسەرەکەت تەنانەت ئەگەر پێویست بکات قوربانی گەورە بدەیت لەو پێناوەدا وەکو لەدەستدانی کارێک، پەیوەندییەک، یاخود خۆبەگەورەزانی. بریتییە لە لێخۆشبوون بە خێرایی. بریتییە لە نەهێشتنی شتانێک لە ژیانتدا تەنانەت ئەگەر خۆشیشت بوێن ئەگەر ڕێگریت لێ بکەن لە بایەخپێدان و گرنگیدان و خزمەتکردنی هاوسەرەکەت. بریتییە لە بەدەستهێنانی ئاشتی و ئارامی لە ڕێی قبووڵکردنی هەندێک کەموکورتی لاوەکی هاوسەرەکەت، چونکە بیرت بێت سەرەتا کەوتیتە خۆشەویستی ئەو شتانەوە. بریتییە لە زانینی ئەوەی هاوسەرەکەت هەرگیز بە تەواوی لێت تێناگات و بێ بەرامبەر خۆشی ناوێت، چونکە ئەوانیش دروستکراوی کامڵ و تەواو نین و هەرچۆنێک بێت تاکو کۆتایی خۆشت بوێت.

ڕەنگە هاوسەرگیری تەنها ڕاهێنانێک بێت کە پێویستە بۆ گوزەرکردن لەم جیهاندا، بە تایبەت کاتێک دوو کەسی دوڕاو لەماڵێکدا دەژین و هەردوو لا ملکەچن. جیهانێک کە قوتت دەدات و دەتتفێنێتەوە بەبێ ترسی بەردەوام لە نەهامەتی و ناخۆشی. ڕەنگە پێویست بکات بە چەشنێک بین بردنەوە چێژ و خۆشی خۆی لەدەست بدات و پێشبڕکێکە بکەینە قوربانی لەپێناو کەسانی تردا. ڕەنگە پێویست بکات ببینە دەستەیەکی دۆڕاو لە جیهانێکدا کە تێکچووە بە پێشبڕکێکردن لەپێناو بردنەوەدا. ئەگەر ئەو کارە بکەین، ڕەنگە بتوانین لە شەواندا ئارامتر بنووین و تەماشای نێوچاوی خۆشەویستانمان بکەین و ببەخشین و لە یاد بکەین و چەپڵە بۆ کەسانی چواردەورمان لێ بدەین.

بڕوام وایە لە هاوسەرگیری دۆڕاوەکاندا هەماهەنگییەک دروست دەبێت و هەموو ژیان دەبێتە جۆرێک لە یاخیبوون کە درەوشاوەترە لە هەتاو. یاخیبوونە چاکەکان بەردەوامن و جیهان بەرەو دۆخێکی باشتر دەبەن هاوشێوەی ئەوەن، وانییە؟ چارەسەر دەکەن و ئاوەدان دەکەنەوە. گەورەن و هاوشێوەی هەتاو دەدرەوشێنەوە. هاوشێوەی هەتاو هێزی ڕاکێشانیان بەرگەنەگیراوە.

# چیرۆکی ژیانمان



لۆرا مونسۆن نووسەری پرفرۆشترین پەرتووکی، «ئەمە ئەو چیرۆکە نییە کە بیری لێ دەکەیتەوە.» و دامەزرێنەری «هاڤن ریتریتس»ـە. بەم شێوەیە چیرۆکی خۆی و مێردەکەی دەگێڕێتەوە:

با بڵێین لە هاوسەرگیرییەکی تەندروست و باشدایت. هێشتا هاوڕێ و خۆشەویستی یەکترن، دوای تێپەڕاندنی نیوەی تەمەنتان پێکەوە. ئەو خەونانەی لە تەمەنی بیست ساڵییەوە دەتانویست بە دەستی بهێنن لە چاوی یەکتردا وەکو ڕووناکی مۆمی کافتریاکانی شار دەدرەوشێنەوە کاتێک سەڵت و لاوازیت و زۆرێکی هاتوتە دی.

دوو دەیە دوای ئەوە دەبیتە خاوەنی بیست دۆنم زەوی، خانوویەک، منداڵ، سەگ و ئەسپ. نموونەی ئەو دایک و باوکە دەبیت کە ویستووتە و پڕیت لە خۆشەویستی و چاودێری هەمووان. هەموویت جێبەجێ کرد: دیزنی لاند و کامپین و هاوای و مەکسیک و ژیان لە شار و ڕوانین لە ئەستێرەکان.

دڵنیابە گرفتت لە پەیوەندی هاوسەرگیریدا دەبێت، بە گشتی زۆر ناڕازیت لەوەی شتەکان بە چەشنێک بەڕێوە چوون، کە هەرگیز بە خەون و خەیاڵیشتدا نەهاتووە ئەم وشانە لە مێردەکەتەوە ببیستی لە ڕۆژێکی خۆشی هاویندا «خۆشم ناوێیت، ڕۆژێک نەبووە کە

خۆشم ویستبێت. من دەڕۆم. منداڵەکانیش لێم تێدەگەن و دەیانەوێت خۆشبەخت بم.»

ئەمە چیرۆکی جیابوونەوە و تەڵاق نییە و چیرۆکی پاڕانەوە لە مێردەکەم نییە تاکو بمێنێتەوە. چیرۆکی بیستنی «چیدی خۆشم ناوێیت»ـە لە مێردەکەمەوە و بڕیاردانە لەوەی بڕوای پێ نەکەم. پاشان لە ئەنجامدا چی ڕوودەدات.

سەرنج لەمە بدە: منداڵێک هەڵدەچێت و تووڕە دەبێت. هەوڵ دەدات لە دایکی بدات، بەڵام دایکی لێی ناداتەوە و سزای نادات و ئامۆژگاری ناکات. لەبری ئەوە تەنها فەرامۆشی دەکات. پاشان دایکەکە خەریکی کاروباری خۆی دەبێت، وەک ئەوەی هیچ هەڵچوون و تووڕەبوونێک نەبووبێت. هیچ شتێک ناکات، تەنها وا دەری دەخات هەڵچوونەکە پەیوەست نییە پێوەی و بە شتێکی کەسی تایبەت وەریناگرێت.

با ڕوونتر بڵێم: ناڵێم مێردەکەم هاوشێوەی منداڵێک هەڵچووە. گرفتەکەی ئەو زۆر لەوە گەورەتر بوو کە پەیوەست بوو بە ژیانی گەنجییەوە، کاتێک وا دەزانین ڕێگاکەمان چیدی بەرەوپێش ناڕوات وەکو پێشتر. بڕیارم دا بە هەمان چەشنی هەڵچوونی منداڵەکەم کاردانەوەم بۆی هەبێت. بە هەمان شێوە بۆ ماوەی چوار مانگ وەڵامم دەدایەوە.

«چیدی خۆشم ناوێیت و هەرگیز خۆشم نەویستوی.» وشەکانی هاوشێوەی مستەکۆڵەیەکی توند بەرەو ڕووی من هاتن. هەرچۆنێک بێت توانیم فەرامۆشی بکەم. کاتێک هاتمەوە هۆش و خۆمم کۆنتڕۆڵ کرد، وتم: «گرنگ نییە بە لامەوە».

بە سەرسامییەوە کشایەوە. وا دیار بوو پێشبینی کردبێت بدەمە پرمەی گریان و لێی تووڕە بم و هەڕەشەی لێ بکەم، یاخود لێی

بپارێمەوە تاکو بڕیارەکەی بگۆڕێت. پاشان وتی: «حەزم لەو شێوازەی ئێستات نییە.»

کەمێک وەستام. چۆن دەتوانێت شتێکی لەو چەشنە بڵێت؟ لەو کاتەدا ویستم تووڕەبم و شەڕ بکەم و بگریم، وەلێ هیچم نەکرد. لەبری ئەوە ئارامییەک دایگرتم و ئەم وشانەم وتەوە: «گرنگ نییە بە لامەوە.»

دەبینیت لەم دواییەدا پەیوەست بووم بەوەی کۆتایی بە نەهامەتییەکانم بهێنم و لە کۆتاییدا توانیم ئەو دەنگانە لە مێشک و خەیاڵمدا دەربکەم کە پێیان وتم: خۆشبەختیم هاوشێوەی سەرکەوتنەکانمە و پەیوەستن بە شتانێکەوە کە لە دەرەوەی دەسەڵاتی خۆمدان. گەمژەیی ئەو هاوکێشەیەم بینی بوو و بڕیارم دا بەرپرسیارێتی خۆشبەختی خۆم هەڵگرم.

مێردەکەم هێشتا ئەو شێوازی تێگەیشتنەی نەبوو. چێژی لە چەندین ساڵەی کارکردنی وەرگرتبوو، پاداشتەکەی بژێوی ژیانی خێزانەکەمانی دابین کردبوو، هەوڵە نوێیەکەی بە باشی بەڕێوە نەدەچوو و توانای بوونە نانپەیداکەری خێزانەکە بەرەو کزی ڕۆیشت. بەم هۆیەوە زۆر خەمبار بوو، هەستی بە بێسوودی دەکرد و لەنێو هەستەکانیدا ون بوو. پاشان دەیەویست لە خێزانەکە بچێتە دەرەوە، وەلێ بە لامەوە گرنگ نەبوو.

وتم: «من هەست ناکەم منداڵەکان نیگەرانی خۆشبەختی دایک و باوکیان بن. مەگەر ئەوەی بتەوێت پەیوەستییەکی زۆریان بۆ دروست بکەیت بۆ ئەوەی ژیانیان لە پەیوەندییەکی خراپدا بگوزەرێنن. کات هەیە لە پەیوەندییەکاندا کە لایەنەکان پێویستیان بە پشوویەک هەبێت. دەتوانین چیت بۆ بکەین تاکو ئەو پشووەت بۆ بڕەخسێنین بێ ئەوەی زیان بە خێزانەکە بگەیەنین؟»

وتی: «چی؟»

«برۆ بۆ گەشتێک بۆ نیپاڵ، کوخێک دروست بکە لە مێرگەکە، ستۆدیۆی گەراجەکە بکەرە ئەشکەوت، ئەو دەفە بهێنە کە هەمیشە حەزت لێی بووە، هەر شتێکی تر کە ئارەزووی دەکەیت، وەلێ ئازاردانی من و منداڵەکان کارێکی بێمانایە کە لە بارەیەوە دەدوێیت.»

پاشان دووبارەم کردەوە: «دەتوانین چیت بۆ بکەین تاکو ئەو پشووەت بۆ بڕەخسێنین بێ ئەوەی زیان بە خێزانەکە بگەیەنین؟»

«چی؟»

«چۆن دەتوانین ئەو پشووەت بۆ بڕەخسێنین؟»

وتی: «من پشووم ناوێت، دەمەوێت جیا ببمەوە.»

شتی زۆر بە خەیاڵمدا هاتن. ئایا ئافرەتێکی تر بوونی هەیە؟ دەرمانی بێهۆشکەر؟ نهێنییەکی ترسناک هەیە؟ پاشان وەستام. تووشی نەهامەتی نایەم. لە بری ئەوە ڕۆیشتمە سەر مێزەکەم و لە گوگڵ گەڕام: «جیابوونەوەی بەرپرسیارانە» و لیستێک هاتە پێشەوە. ئەم شتانەی لەخۆ دەگرت: کێ ڕێدراوە کارتی ئەژمار بەکار بهێنێت؟ منداڵەکان لەگەڵ کێدا دەتوانن لە شارۆچکەکە بتبینن؟ کێ دەتوانێت کلیلەکان بەکار بهێنێت؟

تەماشای تەواوی لیستەکەم کرد و خستمە بەردەستی ئەو.

وەڵامی دایەوە: «کلیلەکان؟ تەنانەت کلیلی خانووەکەیشمان نییە.»

بایەخم پێی نەدا. ئازارم لە چاوەکانیدا هەست پێ دەکرد.

وتی: «ئێ، تێگەیشتم چی دەکەیت. دەتەوێت بچمە ژێر چارەسەرەوە. ناتەوێت من جیا ببمەوە. منداڵەکان لە دژم هان دەدەیت.»

«هەرگیز وام نەوتووە. تەنها پرسیم دەتوانین چیت بۆ بکەین تاکو پشوویەک بدەیت کە پێویستتە؟»

«وازبهێنە!»

مێردەکەم جیا نەبوویەوە، وەرزی هاوینی بە کەمتەرخەمی و خەمساردانە گوزەراند. کاتژمێر شەش نەدەگەڕایەوە. تاکو درەنگ لە دەرەوە دەمایەوە و پەیوەندی نەدەکرد. گرنگی بە ڕۆژی چواری مانگی تەمموز نەدا، بۆ ئەوەی پێکەوە پیاسە بکەین و کەباب ببرژێنین و یاری ئاگرین بکەین و بچین بۆ ئاهەنگی کەسانی دی. کاتێک لە ماڵەوە دەبوو، خۆی دوور دەگرت. تەماشای چاوەکانی نەدەکردم. تەنانەت نەیوت: «یادی لەدایکبوونت پیرۆز».

هیچ خۆم تێهەڵنەقورتان. ڕێی خۆم گرتبوو. بە منداڵەکانم وت: «باوکتان کاتێکی سەخت بەڕێ دەکات، هاوشێوەی کەسانی پێگەیشتووی دی. هەرچییەک بێت، ئێمە خێزانێکین.» من و منداڵەکانم نیگەران نەبووین.

هاوڕێ دڵسۆزەکانم لەبری من تووڕە بوون: «چۆن دەتوانیت هیچ نەکەیت و بەرگەی ڕەفتارەکانی بگریت؟ دەریبکەرە دەرەوە! پارێزەرێک بگرە.»

بە گوێی ئەوانیشم نەکرد. ئەم پیاوە ئازاری هەیە، ئەوەش گرفتی من نییە تاکو چارەسەری بکەم. لە ڕاستیدا دەبوو لەسەر ڕێی دوور بم، تاکو

بتوانێت چارەسەری بکات. دەزانم بیر لە چی دەکەیتەوە: کەسێکی لاواز و ترسنۆکم و بەرگەی هەموو شتێک دەگرم لەپێناو مانەوەی خێزانەکەم پێکەوە. ڕەنگە لەو ئافرەتانە بم کە تەنانەت بەرگەی چەوساندنەوەی جەستەییش بگرم. دڵنیات دەکەمەوە من بەو شێوەیە نیم. من ئەسپی ١٥٠٠ پاوەند بەرز دەکەمەوە بۆ نێو بارهەڵگر و بەنێو ناوچە بەرزەکانی مۆنتانادا تەواوی هاوین غار بە ئەسپ دەدەم. بەرگەی منداڵبوونی سروشتی و نەشتەرگەریم

گرتووە بەبێ وەرگرتنی دەرمان. بە کورتی تێگەیشتم کە من هۆکاری گرفتی مێردەکەم نیم، بەڵکوو خۆی بوو. ئەگەر گرفتەکەی بکردایەتە شەڕێکی هاوسەرگیری، دەیکردە گرفتی ئێمە. پێویست بوو لەسەر ڕێی لاچم، تاکو ئەوە ڕوونەدات. بڕیارم دا ماوەی شەش مانگ دەرفەتی بۆ بڕەخسێنم.

بە ڕۆژگاری خۆش و سەختیشدا تێپەڕیوم. لە ڕۆژە خۆشەکاندا ڕێگای خێرام دەگرتە بەر و هەست و وتە ڕەقەکانی مێردەکەم فەرامۆش دەکرد. لە ڕۆژە ناخۆشەکاندا خۆم دەدایە بەر خۆری مانگی ئاب و ڕقم لە مێردەکەم دەبوویەوە، لە کاتێکدا منداڵەکان بەنێو ئامێری ئاوپرژاندنەکاندا ڕایاندەکرد. هەرگیز سازشم نەکرد. هەرچەندە بە شتێکی بێمانا دادەنرێت بڵێم: «بە شتێکی کەسی وەریمەگرە.» کاتێک مێردەکەت پێت دەڵێت کە چیدی خۆشی ناوێیت و هەندێک جار پێویستە تۆش هەمان شت بکەیت.

لەبری ئەوەی هاوار بکەم و بگریم، یاخود بپاڕێمەوە، چەند بژاردەیەکم خستە بەردەمی. هاوینێکی خۆشم ڕەخساند بۆ خێزانەکەم و بە بەشداریکردن، یاخود نەکردنی، پێشوازیم لێی کرد، کەوتبووە سەر بڕیاری خۆی. ئەگەر بەشدار نەبووایە، ئەوە بیرمان دەکرد، وەلێ بەبێ بوونی ئەویش هەر باش بووین. بەڵێ، بە دڵنیاییەوە دەمویست لەگەڵیدا دانیشم و ڕازیی بکەم کە بمینێتەوە، خۆشی بوێم، شەڕ بکەین بۆ ئەو شتەی بۆی دروست بووین، وەلێ نەمکرد.

گۆشتم دەبرژاند و شەربەتی لیمۆم دروست کرد و مێزێکی چوار کەسیم ڕازاندەوە، لە دووریشەوە خۆشم دەویست. ڕۆژێکیان زوو لە کار گەڕایەوە ماڵەوە و گیای دەبڕی. کەس

گیایەکەی خۆی نابڕێت ئەگەر مەبەستی ڕۆیشتن و جێهێشتنی بێت. پاشان دەرگایەکی چاک کردەوە کە ماوەی هەشت ساڵ بوو شکابوو. هەروەها وتی، کە پێویستە بەرهەیوانەکە بۆیاخ بکات. هەروەها وتی، پێویستە زستانی داهاتوو داری بۆ پەیدا بکەین. وردە وردە کەوتە باسکردنی داهاتوو. لە ساتی ئێوارەخوانی یادی سوپاسگوزاریدا بوو کە مۆری لەسەر کرد. مێردەکەم بە نەرمییەوە سەری دانەواندەوە و وتی: «سوپاسگوزارم بۆ بوونی خێزانەکەم.»

بەڵێ، مێردەکەم گەڕایەوە بۆ ناومان. بینیم کە چی شتێک لەناو چووە: شانازیبەخۆکردن. مێردەکەم شانازیکردنی لە خۆیدا نەهێشت. ڕەنگە ئەوە ڕوویدات کاتێک لە نیوەی تەمەنداین و دواتر بۆمان دەردەکەوێت چیدی گەنج نین.

ئەوە هاوسەر، زەوی، پیشە، یاخود پارە نییە کە خۆشبەختیمان بۆ دێنێت. ئەو دەسکەوتانە و پەیوەندیانە تەنها خۆشبەختیمان زیاد دەکەن. خۆشبەختی لە ناخی خۆمانەوە سەر هەڵ دەدات. پشتبەستن بە هەر هاوکێشەیەکی تر دەکرێت ترسناک بێت.

مێردەکەم لەنێو ئەفسانەکاندا ون بوو، بەڵام دواتر ڕێگەی ڕزگاربوونی دۆزییەوە. دوای ئەوە گفتوگۆیەکی زۆرمان کرد. لە ڕاستیدا مێردەکەم هانی دام لە بارەی ئەزموونە سەختەکەمانەوە بنووسم، تاکو هاوکاری هاوسەرانی تر بکات لەو دۆخانەدا. ئەوانەی هەست بە ترس و چەقبەستوویی دەکەن و هەست دەکەن هەستەکانیان هەمیشەیین و ڕێگەی ڕزگاربوونی ئاسان دەدۆزنەوە و وا هەست دەکەن کە دەتوانن ڕزگاریان بێت. مێردەکەم ویستی بۆ ئازارەکانی لۆمەم بکات.

## هەڵەکەی چی بوو؟

وتە و تەکنیکەکە گاڵتەجاڕانە و خراپ بوو. بە تەواوی هەستەکانی مێردەکەی فەرامۆش کرد و بە توورەبوونێکی منداڵانە بەراوردی کرد، لە بری تێگەیشتن لە هەستەکانی و کارکردن لەسەریان. دواتر شانازی دەکرد بەوەی چۆن خۆی ڕزگار کردووە و وتوویەتی: «هیچ لام گرنگ نییە.» کاتێک مێردەکەی هەستەکانی خۆی بۆ دەربڕیوە. هیچ هاوخەمییەکی ڕاستەقینە بوونی نەبووە. هاوخەمی بریتییە لە تێگەیشتن لە هەستی کەسێک لە ڕوانگەی خۆیەوە، نەک خۆتەوە. میهرەبانی بریتییە لە تێگەیشتن لەو هەستانە، تەنانەت ئەگەر حەزیشت لێیان نەبێت. پێزانین و هاوخەمی و میهرەبانی گرنگن بۆ پەیوەندییەکی سەرکەوتوو. بە پێچەوانەوە گێچەڵی هەست و سۆزی بریتییە لە سەپاندنی ئەوەی کە نابێت کەسێک بەو شێوەیە هەست بکات. ڕەنگە ڕاستییەکە ئەوە بێت ژنەکە هیچ بیرۆکەیەکی نەبووە لە بارەی ئەوەی گرفتێک لە هاوسەرگیرییەکەیاندا هەبووە و ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ کەمی توانای بینینی شتەکان، نەک لەڕوانگەی خۆتەوە، بەڵکوو لە ڕوانگەی هاوسەرەکەتەوە.

## سەرکەوتوو بوو

باشە چۆن بزانین؟ تەنها لەبەر ئەوەی مێردەکە فریزەکەی دەبڕی و لە یادی خوانی سوپاسگوزاریدا سوپاسگوزاریی خۆی دەربڕی؟ ئەوە بە جددیتە؟ دەروونی مرۆڤ لەوە ئاڵۆزترە. سەرنج بدە دەبینیت تەواوی بابەتەکە لە ڕوانگەی ژنەکە خۆیەوە نووسراوە، ئەی چی لەبارەی ڕوانگەی مێردەکەوە؟ تەنها شتێک بزانین لەبارەی هەستەکانی مێردەکەوە ئەوەیە کە ژنەکەی وەڵامی

دایەوە بە: «لام گرنگ نییە.» ئەگەر بابەتەکە لە ڕوانگەی مێردەکەوە نووسرابا، ئەوکات دەموت کە هەستی چۆنە. بەڵام وتنی ئەوەی ژنەکە سەرکەوتوو بووە، چونکە مێردەکەی جێی نەهێشتووە شتێکی باشە. ئایا هەرگیز گوێبیستی ئەوە نەبووین هاوسەرەکان لەپێناو منداڵەکانیاندا پێکەوە مابێتنەوە؟ یاخود چی دەبوو ئەگەر مێردەکە هەستەکانی بشاردایەتەوە، چونکە بە لای ژنەکەیەوە پەسەندکراو نەبوون. بە لای ژنەکەوە گرنگ نەبوو. ژنەکەی تەکنیکێکی قۆرخکردنە کە دەریدەخات چی شتێکی بەدڵە و چی بەدڵ نییە. دەروونناسەکان بەم تەکنیکانە دەڵێن: «هۆکارەکانی چەوسانەوە» و باش نین، یاخود ئایا دەکرێت بە تەکنیکی پەیوەندی و ئاخاوتنی سەرکەوتوو دابنرێن. ئەم هۆکاری چەوساندنەوانە دەبنە هۆی بەشداربوون لەوەی دکتۆر هاڤیل هێندریکس لە پەرتووکەکەی بە ناوی، «بەدەستهێنانی ئەو خۆشەویستییەی دەتەوێت» بە «خودی هەڵە» «خودی ونبوو»، یاخود «خودی حاشالێکراو»، ناوزەندی دەکات. ئەم تەکنیکە لە لایەن زۆرێک لە دایبابانەوە بەکار دێت لەگەڵ منداڵەکانیاندا و جێی داخە کە شانازی پێوە دەکەین کاتێک لەنێوان هاوسەرەکاندا بەکار دێت.

هەروەها پێویستە بوەستین لە هەڵسەنگاندنی سەرکەوتنی هاوسەرگیری تەنها بەوەی مێردەکە لەو چواردەورەدا دەمێنێتەوە بۆ بڕینی گیا و فریز و سوپاسگوزار دەبێت لە ئێوارەخوانی یادی سوپاسگوزاریدا. شتێکی قووڵتر لە پەیوەندی سەرکەوتوودا هەیە. ئەوە هەڵسەنگاندنی هاوسەرگیری نییە. زۆر کەس ستایشیان دەکرد بەو کارەی ئەنجامی داوە، چونکە ئەو نەیویستووە جیا ببێتەوە. کەمێک هەن هەوڵیان داوە دۆخەکە لە ڕوانگەی مێردەکەیەوە هەڵسەنگێنن. لە یادت بێت ئەوەی کە دەیەوێت جیا ببێتەوە

هەمیشە کەسە خراپەکە نییە و ئەوەی دەیەوێت بمێنێتەوە هەمیشە قوربانییەکە نییە. پەیوەندییەکان زۆر لەوە قووڵترن.

تاکە شتێک کە لێی دڵنیاین ئەوەیە ژنەکە ئامانجەکەی خۆی پێکاوە. بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە دەستی بەسەر ڕەفتار و هەستی مێردەکەیدا گرتووە، وەلێ نەیتوانیوە بە باشی لێیان تێبگات و هاوخەمی بێت. ئەم بابەتە پەیامێکی ترسناکی لە بارەی کۆمەڵگاکەمانەوە خستە ڕوو، کە ڕەنگە زیاتر ئارەزووی دەستبەسەرداگرتنی ڕەفتاری کەسانی دی بین، نەوەک ئەوەی لێیان تێبگەین.

## کام ڕێگا باشتر بوو؟

سەرەتا دەبوو هەستەکانی مێردەکەی بەرز بنرخێنێت و ڕێزی بگرێت، لەبری ئەوەی نکوڵی لێ بکات، یاخود فەرامۆشی بکات. ئەمانە بنچینەکانی پەیوەندی نێوان کەسەکانن. بەراوردکردنی هەستەکانی پیاوێکی پێگەیشتوو بە تووڕەیی و هەڵچوونی منداڵ نموونەی بێڕێزییە. دوای ئەوە دەبوو هەنگاو بەرەو یەکتر بنێن. دەبوو لەبری فەرامۆشکردن و بەکەمزانین و نکوڵیکردن لە هەستەکانی مێردەکەی پێشنیاری ڕاوێژی بکردایە، یاخود لەو شتانە ڕابمایە کە خۆی دەیتوانی لەپێناو باشترکردن و پەرەپێدانی پەیوەندییەکەیان، ئەنجامیان بدات. بە پێچەوانەوە بە تەواوی نکوڵی دەکرد لەوەی گرفتێک لە هاوسەرگیرییەکەیاندا هەبێت. پاشان تەواوی لۆمەکەی خستە ئەستۆی مێردەکەی. وا دەریخست کە کێشەکە سەد لە سەد دوورە لە خۆیەوە و پاشان فەرامۆشی کرد و چاوەڕێی کرد نەمێنێت. ئەوە شتێکە کە نابێت لە پەیوەندییەکدا، یاخود پەرەپێدانی خۆتدا ئەنجامی بدەیت.

بە دڵنیاییەوە هیچ تێرامانێک نەبوو لەوەی کە ڕەنگە بتوانێت خۆی بگۆڕێت تاکو پەیوەندییەکە باشتر بکات. لەبری ئەوە تەواوی گرفتەکەی بەوە لێک دایەوە کە مێردەکەی منداڵێکی ناژیرە و خۆیشی قوربانییەکەیە. تێناگەم قوربانی چۆن لێکداوەتەوە. ئەوە بە چەوساندنەوە و گێچەڵی هەستی دەزانم. بڕوام وایە ئەم ڕووداوە زۆر شت لەبارەی هەست و سۆزی کۆمەڵگەکەمان ڕوون دەکەنەوە، کاتێک ڕەفتارەکانی ژنەکە نەک ئەوەی قبووڵ دەکرێت، بەڵکوو ستایشیش دەکرێت.

تەنانەت ئەگەر مێردەکەی هەندێک لە خەمەکانی خستبێتە سەر ژنەکەی، تاکو بڕوا بکات هیچ شتێک نییە ژنەکە بتوانێت ئەنجامی بدات، تاکو گرفتەکە سووک بکات، بریتییە لە خۆبەڕاستزانین. بیرکردنەوە لەوەی کە ئێمە ئامادەبوویەکی ناکاریگەرین لە گرفتەکانماندا، یاخود گرفتەکانمان بە تەواوی بەهۆی هەڵەی کەسێکی ترەوەیە بریتییە لە گرنگیدان بە خود و هەڵەیە. بە دڵنیاییەوە هەندێک شت هەبوو دەیتوانی ڕۆڵی تێدا هەبێت و لە خۆیدا بیگۆڕێت تاکو هاوسەرگیرییەکەیان بەهێز بکەن. هیچ کەس کامڵ و بێ کەموکورتی نییە و هەمووومان شتانێکمان هەن کە دەتوانین لە خۆماندا باشتریان بکەین، تاکو پەیوەندییەکانمان بەهێز و پتەو بکەین، بەڵام بیرکردنەوە لەوەی تەواوی گرفتەکە بەهۆی هەڵەی ژیان و ناڕازیبوونی ڕۆحی مێردەکەیە، لە کاتێکدا تەواوی لۆمەکە لەسەر خۆی لا بدات و بیخاتە سەر مێردەکەی و وا دابنێت کە هیچ شتێک نییە خۆی بتوانێت بەرەوپێشی ببات، یاخود بیگۆڕێت.

# گرفتی گەنجیم



هەمووان گرفتیان هەس، بەڵێ مامۆستای پۆلی حەوتەممان وای پێ وتین. داوای لێ کردین هەموو گرفتەکانمان هاوشێوەی تۆپێک لێ بکەین و بیخەینە شوێنێکەوە کە پڕ بوو لە گرفتی کەسانی دی. پاشان پێی وتین ئایا ئەگەر بژاردەیەکمان بخرێتە بەردەست، هەموومان تۆپەکەی خۆمان هەڵدەبژێرین؟

هەرچەندە زۆر منداڵ بووم تاکو بە تەواوی لەم لێکچواندنە تێبگەم، وەلێ زانیم هەمووان گرفتیان هەس، منیش یەکێکم لەو کەسانە. گەورە بووم و خەمۆکی بوویە بەشێکی سروشتی ژیانم. بە درێژایی قۆناغی ناوەندی و لە قۆناغی ئامادەییدا نمرەی نزمم بەدەست دەهێنا و خەمۆکی بەردەوام بوو. بە کورتی هەمیشە خەمۆکیم هەبوو.

ڕۆژێکیان لە قۆناغی دەی ئامادەیی هەستم بە هەناسە تەنگی کرد. تێنەگەیشتم بۆچی، وەلێ هەستم کرد سییەکانم هەوایان بۆ ناچێت. تەواوی ڕۆژەکە و ڕۆژی دواتر بەو شێوەیە بوو. کاتێک بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک ئەم هەناسە تەنگییەم بەردەوام بوو، لە کۆتاییدا چوومە سەردانی پزیشک. پشکنینی بۆ سییەکانم و هەناسەدانم کرد، پاشان وتی: «هەست دەکەم تووشی خەمۆکی بوویت.»

هەناسە تەنگیم بە درێژایی ئەو ساڵە بەردەوام بوو. هەرچییەکم دەکرد نەمدەتوانی لێی ڕزگار ببم، هەروەها نەمدەتوانی خەمۆکییەکەم چارەسەر بکەم کە هۆکاری هەناسە تەنگییەکەم بوو. تەنها و تەنها ئارەزووی ژیانێکی ئاساییم دەکرد. هەموو ڕەنگێک باشتر و جوانتر بوو لە ڕەنگی خۆڵەمێشی، هەروەها هەموو تۆپێک باشتربوو لە تۆپی خەمباری. لەپێناو هەڵبژاردنی تۆپێکی تردا، هەموو شتێکم دەبەخشی.

هاوینی پێش قۆناغی یازدەی ئامادەیی بۆ یەکەمجار تووشی تۆپێکی جیاواز بووم، تۆپێک کە کەسێکی دی هەڵیدابوو. ئەو ساڵە تووشی ترس بووم. لە ماوەی وەرزی یکەمی قۆناغی یازدەی ئامادەییدا مامۆستای زیندەزانی هەڵیبژاردم بۆ دەستەی سەرکردایەتی نیشتمانی گەنجان لە پزیشکیدا. توانیم بە هاوکاری خوشکەکەم کە پارەی خوێندنەکەمی دەدا، بەشدار بم.

لەو کاتەدا دڵنیا بووم لەبارەی بوونە پزیشک، هاوشێوەی دڵنیایم لەوەی کۆنفرانسەکە بیرۆکەیەکی باش بوو. دواتر بۆم دەرکەوت زۆر هەڵە بووم. بە دڵنیاییەوە دواتر درکم بەوە کرد زۆر هەڵە بووم لە بارەی هەردووکیانەوە. بەشی پزیشکی گونجاو نەبوو بۆم و کۆنفرانسەکەش بیرۆکەیەکی باش نەبوو. لە ڕاستیدا ئەگەر لەو کاتەدا بمزانیایە دوای کۆنفرانسەکە چی ڕوودەدات، هانی خوشکەکەم دەدا لەبری ئەوە پشک بکرێت، یاخود تەنها وا خۆم نیشان بدایە پێوانی لێدانی دڵم دەکەم.

تەنها لە دەربڕینێکی سادە دەچوو، وەلێ بەو چەشنە نەبوو. دەزانیت زیهن شوێنێکی هەستیارە و زۆر بە سەختی هاوسەنگ دەبێت. باشترە دەستکاری نەکرێت. لەو ڕۆژەی مانگی شوباتدا دەستکاری هاوسەنگییەکەم کرد و تەنانەت نەمدەزانی چیم کردووە.

لە ماوەی کۆبوونەوەیەکدا لە بارەی ئەوەی چەندە سەرنجڕاکێشە ببیتە پزیشکی ئێسک، داوامان لێ کرا لێدانی دڵمان بپێوین. گرفتم هەبوو لە پێوانی لێدانی دڵمدا، بۆیە خوێندکارێکی بەشی پزیشکی یارمەتی دام.

نیگەران دیار بوو و وتی: «لێدانی دڵت لە سەرووی سەدە، ئەم ڕێژەیەش کەمێک زیادە بۆ لێدانێکی ئاسایی.»

تەنها وتەیەکی ئاسایی بوو و بۆ تەواوی ساڵەکە نیگەرانی کردم. کاتێک گەڕامەوە ماڵەوە، جارێکی تر پشکنینم بۆ لێدانی دڵم کردەوە. هێشتا ڕێژەکەی بەرز بوو. زۆر ترسام. نەمدەزانی گرفتەکە لە چی دایە. چی بەسەر دڵمدا دێت ئەگەر بەم شێوەیە بەردەوام بێت؟ چۆن دەبێت بەم شێوەیە بێت؟ بیرم کردەوە «من لەسەرخۆ خۆم دەکوژم و ناتوانم هیچ شتێک بکەم.»

بەردەوام بیرم دەکردەوە، ئایا دەبێت دڵم شەکەت و ماندوو بێت و لە لێدان بوەستێت؟ لەگەڵ هەر بیرکردنەوەیەکی نەرێنی و بێزارکەردا، لێدانی دڵم بەرز دەبوویەوە و بەهێزتر ترپەی دەهات.

پێویستە ڕابکشێم. وەلێ هیچ شتێک سوودی نەبوو. هونەرەکانی پشوودانم بیر هاتەوە کە ڕاوێژکاری قۆناغی ئامادەیی فێری کردبووین، هەناسەم هەڵمژی و پاشان هەناسەم دایەوە. چەند جارێک ئەم هونەرەم دووبارە کردەوە، وەلێ هیچ سوودێکی نەبوو.

ئەو شەوە و شەوانی تەواوی ئەو ساڵە دەنووستم لە کاتێکدا لێدانی دڵم ترپەی دەهات. بەیانیان کەمێک باشتر دەبووم، بەڵام پێش ئەوەی دەست بکەم بە جووڵە، مێشکی لائیرادیم دەکەوتە کار و جارێکی تر دەیشێواندم. هاوشێوەی زیندانییەک وابووم.

لە کاتێکدا بیرکردنەوەکانی تر دەهاتن و دەچوون، وەلێ ئەم نیگەرانییەم بوویە هاودەمی هەمیشەیی مێشکم. هاوشێوەی

گۆرانییەکی ناخۆش، یاخود دەنگێکی ناخۆش لە گوێدا وابوو. هەرچییەکم بکردایە ئەو بیرکردنەوە ناخۆشەم لەگەڵدا بوو و ڕزگاربوونم لێی نەبوو.

بڕیارم دا لەپێناو هاوسەنگکردنەوەی لێدانی دڵمدا، هەموو شتێک بکەم. ناوم تۆمار کرد بۆ چوونە خولێکی هەناسەدان، تاکو هاوکارم بێت لە پشوودان. کاتێک چوومە خوولەکەوە، تاکە کەس بووم تەمەنم لە خوار حەفتا و پێنج ساڵییەوە بێت و ئامێری هەناسەدان بەکار نەهێنم و تووشی گرفتی هەناسەدان بووبم.

زۆر خێرا درکم بەوە کرد هاوشێوەی گرفتەکانی تر تاکو زیاتر هەوڵی چارەسەرکردنی بدەم، خراپتر دەبوو. بە کوردییەکەی بیرکردنەوەی خۆم بوو ئەو گرفتەی بۆ دروست کردبووم و دواتر نەمدەهێشت کۆتایی بێت.

بۆیە بڕیارم دا لێدانی دڵم فەرامۆش بکەم. کتێبێکی بیرکاریم کردەوە تاکو خۆم بە شتێکەوە سەرقاڵ بکەم. تاڕادەیەک سوودی هەبوو، وەلێ کاتێک هەوڵم دا شیکاری ئێکس بکەم، لێدانی دڵم بیر کەوتەوە و گرفتەکە سەری هەڵدایەوە.

تەنها تەمەنم حەڤدە ساڵان بوو کاتێک ببوومە زیندانیی بیرکردنەوەی خۆم. ئەم ترسە ناخۆش و نالۆژیکییە بە تەواوی دەستی بەسەردا گرتبووم، تاکو ئێستا بیر دەکەمەوە بۆچی بەو چەشنە بوو؟

ڕەنگە سروشتی خۆم وابووبێت، هۆکاری جینات بێت، یاخود ئەوە تەنها وانەیەک بووە و دەبوو فێربم. هەمووان بە دەست شتێکەوە دەناڵێنین، بەڵام لەو هاوینەدا تۆپی کەسێکی ترم هەڵگرت، بۆم دەرکەوت دەبێت ڕۆژێک خەمۆکی هەڵبژێرم.

# دۆزینەوەی بەهەشت



زۆرێک لە تەمەنم لە هەوڵدان بۆ پێکهێنانەوەی دژواری و ئاسانیدا بەسەر برد. لە لایەکەوە پێمان دەوترێت ڕێگا ڕاستەکە ئاسان نییە و پێویستی بە تێکۆشان و قوربانیدانە. لە لایەکی ترەوە ئێمەی مرۆڤ هەمیشە ئارەزووی ئاسانی و خۆشی دەکەین. درکم بەوە کردووە ڕێگاکە هەمیشە پڕە لە ململانێ، تاقیکردنەوە و ناخۆشی. سەختی و دژواری دێتە پێش و زریان هەڵ دەکات. وەلێ بە ویستی پەروەردگار لە ساتی ناڕەحەتییەکاندا، خۆشی و سانایی دێتە پێش بۆت. ئەوەی پشت بە پەروەردگاری ببەستێت بە وشکی و سەلامەتی دەمێنێتەوە، تەنانەت لە ساتی سەختترین و بەهێزترین زریاندا. ڕەنگە لە دەرەوە باران ببارێت، وەلی بە وشکی بمێنییتەوە بەهۆی پەناگەی پەروەردگارەوە. ڕەنگە لە دەرەوە زریان بێت، وەلێ لە ناخەوە هێمنی و ئارامی هەست پێ بکەیت. تەنانەت پریشکی ئاگری ژیانت دەکرێت ببێتە «بَرْدًا وَسَلَامًا»، سارد و بێ زیان بێت هاوشێوەی ئەوەی بەسەر پەیامبەر ئیبراهیمدا(ﷺ) هات. بۆیە زۆر هەڵە بووم هەوڵم دەدا بەهەشتێک دروست بکەم لە دیوی دەرەوەدا کامڵ و بێ زریان و ئاگر بێت، وەلێ ئەمە لەم دونیایەدا بوونی نییە. دەبوو بیرکردنەوەم بگۆڕم. دەکرێت بەهەشتێکی ئارام و پڕ

ئاشتی لە ناخەوە هەبێت. ئارامیت لە ناخی خۆتدایە. هیچ کەسێک ناتوانێت لێتی بسێنێتەوە. هیچ زریانێک ناتوانێت کاری تێ بکات. هیچ بارانێکی پێ ناگات. تێبکۆشە بۆ دروستکردنی ئەو بەهەشتە و چوونە نێویەوە. بەو شێوەیە لەم دونیا و دونیای ئاخیرەتدا بەهەشتت بە قیسمەت دەبێت.

## زریانەکە بەڕێوەیە



دەمەوێت باسی هەژاری و نەداری بکەم. وەلێ ئەو هەژاری و نەدارییە نا کە هەموومان پێی ئاشناین. پێش ئەوەی باسی شتێک بکەین پێویستە پۆلێنی بکەین و پێناسەی بکەین. بۆ ئاخاوتن لەبارەی هەژاری و نەدارییەوە پێویستە تێبگەین هەژاری دەرەکی و هەژاری ناوەکی هەیە. یەکێکیان زۆر لەوی تریان ترسناکترە، چونکە جۆرێکیان دەریدەخات چۆن ژیانێکی کاتی دەژین و ئەوی تریان دەریدەخات چۆن ژیانێکی هەمیشەیی دەژین. باسی جۆری دووەمی هەژاری دەکەم کە زۆر گرنگە. هەژاری ناوەکی بریتییە لە هەژاری ڕۆح. وەسفی ڕۆحێکی نابەرجەستە دەکات. ئەو ڕۆحەی خولقێندراوە، وەلێ شکستمان هێناوە لە درککردن بەوەی بۆچی مەبەستێک خولقێندراوە. ڕۆحێکە ژیانێکی بێ ئامانج و مەبەست دەژی. دڵەکە لێدەدات، وەلێ مردووە، چونکە کاتێک دەگریەت، لە جیهانی ماددەدا خوێنی لێ دەڕژێت و هەست بە ئازار دەکات، ڕۆحەکە هیچ بەم شتانە کاریگەر نابێت. تەنها یەک شت هەیە ڕۆح شەقار بکات و لەناوی بەرێت: دابڕانی لە تاکە پێویستیی ڕاستەقینەی کە نزیکبوونە لە خولقێنەری، کە پەروەردگارە.

**دووەم:** «بەڕاستی ئێوە لە چاوەکانماندان»، تەنانەت لە ساتی نەهامەتی و گرفتەکانیشدا لەنێو چاوی پەروەردگاردایت. خۆی ئاگادارت دەبێت لەو ساتانەدا. ئای چەندە دڵنەواییبەخشە.

**سێیەم:** پێویستە ئارام بگریت، نەک تەنها لەبەر ئەوەی فەرمانی پەروەردگار کۆتایی بە دۆخەکەت دێنێت و دەیگۆڕێت، بەڵکوو لەبەر ئەوەی خۆی ئاگادار و چاودێرە بە سەرتەوە، لە ساتی ناڕەحەتی و نەهامەتییەکاندا، واتە تۆ لەژێر چاودێری و پارێزگاری پەروەردگاردایت و دەتوانیت ئارام بگریت. ئارامگریت خۆی لە خۆیدا یەکێکە لە گەورەترین نیعمەت و بەخششەکانی پەروەردگار.

**پوختەی قسان:** بەهۆی زانایی و دانایی پەروەردگارەوەیە دەزانین و دەبینین بە چی دۆخێکدا دەگوزەرێین و توانای هەیە ئارامیمان پێ ببەخشێت.

## زریانەکە بەڕێوەیە



دەمەوێت باسی هەژاری و نەداری بکەم. وەلێ ئەو هەژاری و نەدارییە نا کە هەموومان پێی ئاشناین. پێش ئەوەی باسی شتێک بکەین پێویستە پۆلێنی بکەین و پێناسەی بکەین. بۆ ئاخاوتن لەبارەی هەژاری و نەدارییەوە پێویستە تێبگەین هەژاری دەرەکی و هەژاری ناوەکی هەیە. یەکێکیان زۆر لەوی تریان ترسناکترە، چونکە جۆرێکیان دەریدەخات چۆن ژیانێکی کاتی دەژین و ئەوی تریان دەریدەخات چۆن ژیانێکی هەمیشەیی دەژین. باسی جۆری دووەمی هەژاری دەکەم کە زۆر گرنگە. هەژاری ناوەکی بریتییە لە هەژاری ڕۆح. وەسفی ڕۆحێکی نابەرجەستە دەکات. ئەو ڕۆحەی خولقێندراوە، وەلێ شکستمان هێناوە لە درککردن بەوەی بۆچی مەبەستێک خولقێندراوە. ڕۆحێکە ژیانێکی بێ ئامانج و مەبەست دەژی. دڵەکە لێدەدات، وەلێ مردووە، چونکە کاتێک دەگریەت، لە جیهانی ماددەدا خوێنی لێ دەڕژێت و هەست بە ئازار دەکات، ڕۆحەکە هیچ بەم شتانە کاریگەر نابێت. تەنها یەک شت هەیە ڕۆح شەقار بکات و لەناوی بەرێت: دابڕانی لە تاکە پێویستیی ڕاستەقینەی کە نزیکبوونە لە خولقێنەری، کە پەروەردگارە.

دابڕانی ڕۆحی هەژاری ڕاستەقینە و حەقیقیە. هەژاری ڕاستەقینە بریتییە لە وەستان بە هەژاری و نەداری لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا. سەرەڕای ئەو ڕاستییە بەردەوامین لە ژیان و خواردندان بە جەستەمان، وەلێ ڕۆحمان برسییە. گرفتەکە لەوەدایە گرنگی و بایەخ بەو لاشەیە دەدەین کە کاتییە و لەناو دەچێت، وەلێ ڕۆحمان کە هەمیشەییە فەرامۆش کردووە. دەگرین کاتێک لاشەیەک دەمرێت، وەلێ مردنی لاشە مردنێکی ڕاستەقینە نییە. تەنها بریتییە لە لابردنی بەرگێک و گواستنەوە لە جیهانێکەوە بۆ جیهانی ڕاستەقینە. شیوەن دەکەین بۆ لاشە مردووەکان. وەلێ دڵەکانمان هیچ کاریگەر نین بەو جەستانەی هێشتا زیندوون، کەچی دڵ و ڕۆحیان مردوون بەهۆی دووری و دابڕانیان لەو کەسەی ژیانی بەخشیوە بە هەموو دروستکراوەکان، ئەویش پەروەردگاری خاوەن دەسەڵاتە.

چی شتێک دڵ لەناو دەبات و وێرانی دەکات؟ چی شتێکە ڕێگە بە دڵ دەدات هەموو شتێکی خۆش بوێت جگە لە پەروەردگار. دڵ بە شێوازێکی زۆر تایبەت و بۆ مەبەستێکی زۆر تایبەت دروست کراوە. کاتێک شکست دێنین لە بەکارهێنانی هەر شتێک بۆ ئەو مەبەستەی بۆی خولقێندراوە، تووشی شکان و لەناوچوون دەبێت. دڵ لە لایەن پەروەردگارەوە و بۆ پەروەردگار خولقێندراوە. دڵ خولقێندراوە تاکو پەروەردگاری پێ بناسیت و خۆشت بوێت. دڵ خولقێندراوە تاکو پێشکەش بە پەروەردگار بکرێت و پڕ بکرێت بە یاد و خۆشەویستی پەروەردگار. ئەو دڵەی پێشکەش بە هەرشتێکی تر دەکرێت، یاخود پڕ دەکرێت لە خۆشەویستی شتانێکی تر، تووشی سەختترین و پڕ ئازارترین هەژاری و مردن دەبێت.

## چاوی دڵ



ئەگەر تووشی دۆخێک، یاخود بڕیارێکی سەخت هاتیت، ئاگادار بە هەوڵ نەدەیت تەنها بە چاوی سەر شتەکە ببینیت. جووڵانەوە بەپێی ئەوەی لە جیهانی دەرەوەدا دەیبینیت، گەورەترین فریودەرە و دەبێتە هۆی لەناوچوون و لاڕێیی. چاوی سەرت دابخە. داوا لە پەروەردگار بکە دڵت بجووڵێنێت و هۆشیاری بکاتەوە. تەنها بە چاوی دڵ دەتوانیت حەقیقەت و ڕاستییەکان ببینیت. تەنها بە چاوی دڵ دەتوانیت لەنێو ئەو خەیاڵاتانەوە ببینیت، بەهۆی ئازار، خۆشی، یاخود ترسەوە بۆت دروست بوون. تەنها بە چاوی دڵ دەتوانیت لەنێو دروستکراوەکان و دۆخە خولقێندراوەکانەوە ببینیت. تەنها بە چاوی دڵ لە هەموو شتێکدا، پەروەردگار بەدی دەکەیت. بزانە و هۆشیاربە تەنها چاوی خاوێن و پاک دەتوانێت هەموو شتێک ببینێت.

# هەر چرکەیەك لەدایكبوونەوەیەکی نوێیە



فێربە هەر چرکەیەک بە ساتی لەدایکبوون بزانیت و لە چرکەی پێشووتر و چرکەی دواتر جودای بکەرەوە. هەر چرکەیەک بریتییە لە بوونێکی نوێ، جیهانێکی نوێ کە تێیدا لەدایک دەبین و دەمرین. گرفتی ئێمە لەوەدایە دەبینە کۆیلەی چرکەساتەکانی ڕابردوومان، دەبینە کۆیلەی جیهانە کۆنەکان کە ڕابردوون و نەماون. وەلێ لە ڕاستیدا ئێمە ڕۆژانە زیاتر لە هەزار جار لەدایک دەبینەوە. کەچی هێشتا زۆرێکمان ڕێ دەدەین بەو سادەییە دووبارە و دووبارە بمرین، کاتێک چرکەساتەکان تێدەپەڕێنین. لە یادی دەکەین هەر چرکەساتێک دەرفەتێکی نوێیە بۆ دەستپێکردنەوە و بەردەوامبوون، بەرزبوونەوە و سارێژبوون و گەشەسەندن، جیاوازبوون و باشتربوون. هەر چرکەساتێکی نوێ بانگەشەی گۆڕان و نوێبوونەوە و گەڕانەوە و تۆبەکردن دەکات. وەلێ ئێمە زۆر سەرقاڵی مردنین.

# خۆشویستنی کەرەستەکان



بهێنە پێش چاوت پێویستت بە سندووقێکی پڕ کەرەستەیە و من پێتی دەبەخشم، پاشان داوات لێ دەکەم خانوویەک بۆ خۆت دروست بکەیت. چەند کەسمان دەکەوێتە خۆشەویستی چەکوشەکە و دروستکردنی خانووەکە لە یاد دەکات؟ چەندێکمان کەرەستەکان بەکار دێنین بۆ لەناوبردنی خۆمان؟ پەروەردگار ئەم جیهانەی پێ بەخشیوین کە چەشنی سندووقێکی پڕ کەرەستەیە. پەیوەندییەکانمان، پارەکانمان، لاشەکانمان، ئەقڵمان، خۆر، ئاسمان و ئەستێرەکان هەموویان بەشێکن لە کەرەستەکانی نێو سندووقەکە. پەروەردگار داوامان لێ دەکات خانوویەک بۆ خۆمان بنیاد بنێین، وەلێ زۆرێکمان کەوتووینەتە خۆشەویستی کەرەستەکانەوە و مەبەست و ئامانجەکەیمان لە یاد کردووە. بەو هۆیەوە خودی خۆیشمان لە یاد کردووە.

بۆچی دەشکێین؟

دوێنێ شتێکی زۆر جوان فێر بووم. دوو جێی نوستنم کڕی، وا دیاربوو لە کەرەستەی زۆر لاواز و ناسک دروست کرابن، بۆیە بە ئاسانی و بە ماوەیەکی کەم شکان. بەشی ژێرەوەیان

گرفتی تێدابوو، وەلێ تاکو نەشکان گرفتەکەمان بۆ دەرنەکەوت. لە ئەنجامی شکانەکەوە، ئەو وەستایەی هات چاکیان بکاتەوە، تەختەی باش و قایمی بۆیان بەکار هێنا، بە چەشنێک شکانیان ئەستەم بوو. هەروەها ئەم شتە لە ژیانی ئێمەیشدا ڕوودەدات. چەندین لاوازی و کەموکورتی ناوەکیمان هەیە. چۆن دەردەکەون و درکیان پێ دەکرێت؟ تەنها بەهۆی شکانەوە درکیان پێ دەکرێت. بەهۆی شکانێکەوە هەست بە کەموکورتی و لاوازی ناخمان دەکەین. هەست بەو کەموکورتییانەمان دەکەین کە وەکو تر ئەستەم بوو بیانزانین. لە ئەنجامی شکانەکەوە دڵ بەهێزتر و پتەوتر دەبێت.

# ئیسلام ستەم و دەستدرێژی پەسەند ناکات



بۆ ئەوانەی دەڵێن، بێدەنگ و خۆڕاگر بن لە بەرامبەر ستەم و دەستدرێژییەکاندا، بزانن پەیامبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: «انصر أخاك ظالمًا أو مظلومًا، فقال رجل: يا رسول الله، أنصره إذا كان مظلومًا، أفرأيت إذا كان ظالمًا كيف أنصره؟ قال: تحجزه أو تمنعه من الظلم فإن ذلك نصره.» «یارمەتی براکەت بدە ئەگەر ستەمکار بێت، یاخود ستەملێکراو.» پیاوێک پرسیی: «ئەی پەیامبەری خودا دەتوانم یارمەتی بدەم ئەگەر ستەملێکراو بێت، وەلێ پێمبڵێ چۆن دەتوانم یارمەتی بدەم ئەگەر ستەمکار بێت؟» پەیامبەر فەرمووی: «ڕێگری لێ بکە لە ستەمکردن. بەو شێوەیە یارمەتی دەدەیت.» صحیح بخاری.

## ژیان، مردن و دیداری کۆتایمان لەگەڵ پەروەردگاردا



ڕۆژی (٣٠)ـی ئەیلولی (٢٠٠٨) کۆتا ڕۆژی مانگی ڕەمەزان بوو. کۆتا ڕۆژی (نووره ڕیشە)ی تەمەن هەژدە ساڵ بوو لەم ژیانەدا، کە خوێندکاری قۆناغی یەکەمی زانکۆی ولایەتی ئەریزۆنا بوو. لە نزیکەی کاتژمێر دەی شەوی (١)ـی مانگی تشرینی یەکەمی (٢٠٠٨) دا شۆفێرێکی سەرخۆش بە ئۆتۆمبێلە نیسانەکەی کێشای بە ئۆتۆمبێلەکەی نوورەدا و لەنێو ئۆتۆمبێلەکەوە هەڵیدا.

ئێوارەی ڕۆژی جەژن بوو، نووره کۆتاساتەکانی لەم ژیانەدا بەسەر برد. ڕۆژی ئاهەنگگێڕان، خێزان و خەڵات بوو، کەس لەو بڕوایەدا نەبوو بە تراژیدی کۆتایی دێت. چەندێکمان بەیانی جەژن بەخەبەر هاتووینەتەوە و بیرمان کردۆتەوە، ڕەنگە بەیانی دواتر زیندوو نەبین؟ چەندێک لە ئێمە تەواوی ڕۆژەکەی ئاگاداری کردەوەکانی بووە؟ ئەوە ڕاستی ژیانی نووره بوو. ڕاستییەک هیچ کەس ناتوانێت ڕێگری لێ بکات و پێشبینیی بکات. ڕاستییەک تەنها دەتوانین ئامادەکاری بۆ بکەین.

مەرگی لەناکاوی نووره، وەکو یادخەرەوەیەک بوو بۆ گەورەترین ئەفسانە لە بارەی بیروڕای ژیانەوە کە کۆمپانیاکان دەیفرۆشن، دەوڵەمەندەکان دەیکڕن و کەسانی ئاسایی بە باوەڕبوون

پێی، ژیانیان دەگوزەرێنن. بریتییە لە بیرۆکەی ئەوەی ئەم ژیانە هەمیشەیی و نەبڕاوەیە. کاتێک وا بیر دەکەینەوە ئەم ژیانە هەرگیز کۆتایی نایەت، هیچ هۆکارێکمان نابێت تاکو ئامادەکاری بکەین بۆ دوای ئەم ژیانە. ئەنجامی ئەم فریودانە بریتییە لە زیادبوونی چێژوەرگرتنی دونیایی، کە خۆی لە شوێنکەوتن و پەرستنی کوێرانەی هەوا و ئارەزووەکاندا دەبینێتەوە.

بە پێچەوانەی ئەم جۆرە کەسانەوە، کەسانێک هەن چاوەڕێی دیداری پەروەردگار دەکەن. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾﴾ (النازعات: ٤٠-٤١). واتە: «وەلێ کەسانێک لە دونیادا ترسابێتن لە ڕاوەستان لە بەردەم پەروەردگاری خاوەن دەسەڵاتدا و زانیبێتی دەگەڕێتەوە لای و لە ترسی ئەودا قەدەغەی نەفسی خۆی کردبێت لە هەوا و ئارەزوو جڵەوگیریی کردبێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە شوێنی گەڕانەوەی بەهەشتە، چونکە لە دونیادا خۆیان پاراستووە و پەروەردگار لە قیامەتدا بە بەهەشت پاداشتیان دەداتەوە».

چاوەڕوانبوونی ئەم دیدارەی پەروەردگار و وەرگرتنی پاداشت، هانی ڕۆح دەدات دژی هەوا و ئارەزووە دونیاییەکان و بۆ مەبەستێکی باڵاتر بجەنگێت. دوای جێهێشتنی ئەم ژیانە بە دیداری پەروەردگارمان شاد دەبین، ئەو چاوەڕوانییەش بریتییە لە زیکر و یادی مردن.

# هەمووان ڕزگاربوون



هەموو دەنگەکان خامۆش بوون
دەنگەکان نوستوون
لە قووڵایی دڵمدا پشوو دەدەم
چاوەڕێی ڕزگابوونیم
وایان کرد هەست بکەین ئازارەکەت بێئەرزشە
بێئەرزشە بە لای پەروەردگارەوە
چونکە بێئەرزشە بە لای ئەوانەوە
ئازارەکەت بێئەرزش نییە بە لای پەروەردگارەوە
لە بەردەم پەروەردگاردا بێهێزیت
وەلێ بێبەها نیت لە لای
ڕزگاربوونم نزیکە
هەرگیز لەم دۆخەدا کەسیانی جێنەهێشت
نە موسا، نە موحەممەد، نە دایکی موسا و مەریەم
ئەیوب، یونس، یوسف، یەعقوب، ئیبراهیم
ئیسماعیل، هاجەرە، ئاسیا، نوح

هەموویان ڕزگاریان بوو
ڕزگابوونم نزیکە
ئەم ئازارە بێئەرزش نییە لە لای ئەو
ئازاری ئافرەتێك بە لایەوە بێئەرزش نەبوو
خەمی ئافرەتێك کە کۆرپەکەی خستە ڕووبارەکەوە
بە لای پەروەردگارەوە بێئەرزش نەبوو.
نزای ئافرەتێك کە سزا دەدرا
بە لای پەروەردگارەوە بێئەرزش نەبوو.
سکاڵای ئافرەتێك بۆ پەیامبەر
بە لای پەروەردگارەوە بێئەرزش نەبوو.
دڵی شکاوی ئافرەتێك کە منداڵەکەی لەدەست دا
بە لای پەروەردگارەوە بێئەرزش نەبوو.
هیوابڕاوی ئافرەتێك کە بەرگەی ئازاری گرت لەژێر درەختێکدا
بەلای پەروەردگارەوە بێئەرزش نەبوو.
ڕزگاریی پەروەردگار هەمیشە نزیکە
هەرگیز کەسیانی لەم دۆخەدا جێنەهێشت.

## بێناونیشان



پاکبوونەوە هەیە لە داننان بە شکستدا
ئارامی کڕنووشبردن
تەنها بە ئارامی لە کڕنووشدا بمێنەوە
و سەرت نزم بکەرەوە
بێ جووڵە
چاوەڕێ کە
خاکی بنوێنە
چاوەڕێ کە
لە نزمیدا بمێنەوە تاکو بەرزت دەکاتەوە
تەواوی جیهان گەڕاون
بۆ ئەو شتەی دەکرێت لە ئارامترین سووچی ژوورێکدا بدۆزرێتەوە
بە ملوێنان وشە گەڕاون بۆ ئەو شتەی دەکرێت تەنها لە بێدەنگیدا
بدۆزرێتەوە
ملیۆنان ناویان دروست کرد بۆ بێناو و ناونیشانەکان
بۆ ئەو شتەی تەنها دەکرێت لە بیرکردنەوەکاندا بدۆزرێتەوە

دۆخی بێناونیشانی
مەهێڵە دەستت بە سەردا بگرێت
ڕێی بدە بڕوات
بهێڵە بڕوات بۆ لای پەروەردگار و ئەویش شکۆ و شانازیت پێ
ببەخشێت
ئەو بەرزت دەکاتەوە
تەماشای هەموو سوچێکی شەقامەکانم کرد
تەماشای ناوەوەی هەموو دووکانێکم کرد
لەنێو دڵشکان و قەشەنگیدا
لەنێو چیرۆکی نێو چیرۆکدا
لە پشتی پەڕەی مۆسیقادا
ناوەکان، هەمیشە بەدوای ناودا وێڵین
هەوڵ دەدەین ناوی هەمووی بنێین
وا دەزانین ئەگەر ناوی هەر کۆت و زنجیرێك بنێین
هەمووی دەشکێت.
ڕەنگە پێویست بکات لەو نێوەندەدا بژیم
لەنێوان وشەکان و دڵدا
لە بۆشایی نێوان زەوی و ئاسماندا
ڕەنگە بتوانم لەوێدا بژیم
لە بۆشایی نێوان زانیاری و تێگەیشتندا
لەنێوان خۆشەویستی و جێهێشتندا
لە شوێنێکدا دوورکەوتنەوە ئازاری نەبێت

شوێنێك تۆی تێدایت
لە بێناونیشانەکەدا
وتی: «وا هەستم کرد هەرگیز ناشکێم.»
بشکێ
بشکێ تاکو بشکێیت
کەوتنە توندەکان، تاکو بتوانن هەڵسنەوە
بکەوە
پاکبوونەوە هەیە لە داننان بە شکستدا
پەیامبەر ئادەم دانی بە شکستی خۆیدا نا
پەیامبەر یونس دانی بە شکستی خۆیدا نا
پەیامبەر نوح دانی بە شکستی خۆیدا نا
پەیامبەر موحەممەد دانی بە شکستی خۆیدا نا
چۆن دەتوانیت بانگەشەی بەهێزیت بکەیت؟

## ڕەحمێك بە من بكە ئەی ڕۆح



ئەی ڕۆح بۆچی شیوەن دەكەیت؟
دەزانیت خاڵی لاوازی منی؟
فرمێسكەكانت هێرش دەبەن و بریندارم دەكەن
دەزانم هەڵەی من نییە
تاكو كەی بەردەوام دەبیت لە شیوەن؟
هیچ شتێكم نییە جگە لە وشە بۆ لێكدانەوەی خەونەكانت،
ئارەزووەكانت و ڕێنماییەكانت.
ئەی ڕۆح، تەماشایەكی حاڵم بكە
تەواوی ژیانم لە فەرمایشتەكانتدا بەسەر برد
بیر لە نەهامەتییەكانم دەكەمەوە
ماندوو بووم لە شوێنكەوتنت
دڵم شكۆدار بوو لەسەر تەختی پادشایەتی
وەلێ ئێستا كۆت و دیلە
ئارامی هاودەمم بوو
وەلێ ئێستا دژی منە

گەنجیم هیوا و ئاواتم بوو
وەلێ ئێستا فەرامۆشم کردووە
ئەی ڕۆح، بۆچی هێندە بەهەڵپەیت و داواکاریت زۆرە؟
خۆشیم لە خۆم حەرام کردووە
و خۆشی ژینم لێ تۆراوە
شوێنی ئەو ڕێیە کەوتووم داوات لێ کردووم
دادپەروەر بە لەگەڵمدا
یاخود بانگی مەرگ بکە تاکو ڕزگارم بکات
دادپەروەری شکۆی تۆیە
ئەی ڕۆح، ڕەحمێك بە من بکە.
هێندە خۆشەویستیت ڕژاندووە بە سەرمدا، کە ناتوانم هەڵیبگرم
تۆ و خۆشەویستی هێزێکی جیانەکراوەن
ئایا هەرگیز ململانێی نێوان بەهێز و لاواز کۆتایی دێت؟
ئەی ڕۆح، ڕەحمێك بە من بکە.
سەروەتێکت پێشان داوم کە ناتوانم دەستی بخەم
تۆ و سەروەت لەسەر لووتکەی چیان
من و خەم پێکەوە لە شیوێکدا جێهێڵراوین
هەرگیز چیا و شیوەکە بە یەك دەگەن؟
ئەی ڕۆح، ڕەحمێك بە من بکە.
قەشەنگیت نیشان داوم،
وەلێ دوایی لێت شاردمەوە.
تۆ و قەشەنگی لە ڕووناکیدا دەژین:

من و نەزانی پێکەوە لە تاریکیدا وەستاوین
هەرگیز ڕووناکییەکە دەست بەسەر تاریکییەکەدا دەگرێت؟
خۆشحاڵی تۆ لە کۆتاییدا دێت
ئێستا لە چاوەڕوانیدا چێژ وەردەگریت
وەلێ ئەم لاشەیە ئازار دەچێژێت لەگەڵ ئەم ژینە
ئەی ڕۆح، ئەمە تەواو ئاڵۆزە.
بەرەو هەمیشەیی هەنگاوی خێرا دەنێیت
وەلێ ئەم لاشەیە بە هێواشی بەرەو لەناوچوون دەچێ
چاوەڕێی ناکەیت
ئەویش ناتوانێت خێرا هەنگاو بنێ
بەرز دەبیتەوە بەهۆی سەرنجڕاکێشی بەهەشتەوە
وەلێ ئەم لاشەیە نزم دەبێتەوە بە هێزی ڕاکێشانی زەوی
دڵنەوایی ناکەیت
و ئەویش بەهای تۆ نازانێت
ئەی ڕۆح، ئەمە خەمە.
دەوڵەمەندیت بە ژیری
وەلێ ئەم لاشەیەم هەژارە لە تێگەیشتن.
تۆ سازش ناکەیت،
و ئەویش فەرمانبەرداریت ناکات.
ئەی ڕۆح، ئەمە ئەوپەڕی ئازارچەشتنە
لە ماتی شەوی تاردا سەردانی خۆشەویست دەکەیت
و چێژ لە شیرینی ئامادەگیی وەردەگریت

وەلێ ئەم لاشەیە هەمیشە دەمینێتەوە
قوربانی دەستی هیوا و جودابییە
ئەی ڕۆح، ئەمە ئەوپەڕی سزا و ئەشکەنجەیە
ئەی ڕۆح، ڕەحمێك بە من بکە.

## لە منداڵێکی سێ ساڵانەوە فێر بووم



دەتوانیت بە تێڕامان لە منداڵەکەت، زۆر شت لە بارەی خۆت و ژیان و پەروەردگارەوە فێر بیت. ئیمڕۆ منداڵە سێ ساڵانەکەم شتێکی پیس کرد، دوای ئەوەی سەرلەبەیانی جارێکی تر پیسی کردبوو. نەیدەویست تووڕە ببم، بۆیە دەستی کرد بە خاوێنکردنەوەی و وتی: «خاوێنی دەکەمەوە. خاوێنی دەکەمەوە» پاشان کاتێک بینیی و هەستی کرد تووڕە بووم، خۆی دا بە زەویدا و وتی: «منداڵێکی خراپم»، ڕاستەوخۆ ئارام بوومەوە و دڵنیام کردەوە منداڵێکی خراپ نییە، بەڵکوو منداڵێکی ژیر و ئاقڵە. نەک ئەوەی تووڕەییەکەم نەما، بەڵکوو ویستم ئەو هەست بە باشتر بکات. ببینە چۆن حەزرەتی ئادەم(ﷺ) بەخشرا؟ ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ (الاعراف: ٢٣). واتە: «ئەی پەروەردگار زوڵم و ستەممان لە نەفسی خۆمان کرد، بێگومان لە خەسارەتمەندان و تیاچووانین ئەگەر لێمان خۆش نەبیت و ڕەحممان پێ نەکەیت». باوکە ئادەم(ﷺ) خۆی دانەواند، بۆیە پەروەردگار نەک هەر لێی خۆش بوو، بەڵکوو دووبارە پلەی بەرز کردەوە.

## ئیمڕۆ ڕۆژی پاداشت نییە



هەموومـان پەرۆشـی وەرگرتنـی پاداشـتین و پارەمـان بدرێتـێ. لـە کارەکانماندا تـەواوی ڕۆژ کار دەکەیـن، وەلـێ هـەرگیز پێشـبینی ناکەین هەمـوو سـەر کاتژمێرێـک، یاخـود هەفتەیـەک پارەمـان بدرێتـێ. لەگـەڵ ئەوەشـدا بەردەوامیـن لـە کارکـردن. بـەردەوام دەبیـن لـە کار، چونکـە دەزانیـن پارەکەمـان بـۆ پاشـەکەوت دەکرێـت بـۆ ڕۆژی خـۆی، کـە کۆتایـی مانگـە. بهێنـە خەیاڵـت کارمەندێـک هەمـوو ڕۆژێـک دێتـە سـەر کار و چاوەڕێـی ئـەوە دەکات کۆتایـی ڕۆژ پارەکـەی وەرگرێـت. چـی ڕوودەدات ئەگـەر پارەکـەی نەدرێتـێ؟ ڕەنگـە سـەبر و ئارامـی نەمێنـێ و دەسـت لـە کارەکـەی هەڵگرێـت. ئێمەیـش ڕێـک بـەم شـێوەیە کار بـۆ پـەروەردگار دەکەیـن. کاری بـۆ دەکەیـن و پاداشـت و پارەکەمـان دەوێـت، ئێسـتا و ڕاسـتەوخۆ ئەنجامەکانمـان دەوێـت. بۆیـە شـەکەت و مانـدوو و بێئـارام دەبیـن و واز دەهێنیـن. لـە یادمـان کـردووە ئیمـڕۆ ڕۆژی پاداشـت و مووچـە نییـە.

# ڕزگاربوون



چاوەکانم دادەخەم و بە ئارامی خەیاڵی ڕزگاربوون دەکەم
خەیاڵی شکاندنی هەموو کۆت و زنجیرەکان کە ڕایاگرتووم
دەیانپسێنم
پەرداخی شووشە دەگرمە دیوارەکە
هەموو گۆزەکان وردوخاش دەبن و پاشان ڕزگار دەبم.
ڕزگاربوون
خۆشەویستی دەست دەخەم
خۆشەویستی هەرگیز من دەست ناخات
ڕزگاربوون یەکەمین مەبەستی ئەم ژیانەیە.
هەموو سەرکەوتنێك
هەموو شکستێك
هەموو گەڕانەوەیەك
هەموو برینێك
هەموو خۆشییەك
هەموو ئازارێك

هەموو لەدەستدانێك

هەموو بەدەستهێنانێك

هەموو کۆت و زنجیرێکی شکاو

تەنها بۆ ئەوەبوو دڵت

مێشکت

ڕۆحت

و بوونت

لە لا الە الا اللە تێبگەن

بەم ڕۆحە زیندانییە بڵێت، هەرگیز بەدەست ناهێنرێت.

هیچ شتێك تۆ بەدەست ناهێنێت.

## یادی لەدایکبوونم



چەند ساڵێک لەمەوبەر و لە ڕۆژێکی وەکو ئەمڕۆدا، لە دایک بووم. لە کاتێکدا زۆرێک باسوخواسی ئەوە دەکەن ئایا یادی لەدایکبوون بکرێتەوە، یاخود نەکرێتەوە، دەمەوێت بۆ ساتێک بێمە دەرەوەی ئەو باسوخواسە و تەماشای شتێکی تر بکەم. لە ڕابردوودا درکم بە شتێک کرد. زۆرێکمان یادی لەدایکبوونەکانمان لە چاوەڕوانیکردنی کەسانی تردا بەسەر دەبەین، تاکو یادی لەدایکبوونمان بکەنەوە. منداڵان شەیدا و تامەزرۆی وەرگرتنی خەڵاتن و دڵیان دەڕەنجێت ئەگەر کەسێک لە یادی بکات پێیان بڵێت: «یادی لەدایکبوونت پیرۆز بێت.» نزیکەی چوار بۆ پێنج ساڵ لەمەوبەر تێگەیشتم ئەگەر کەسێک هەبێت یادی بکەمەوە لە ڕۆژی لەدایکبوونمدا، ئەو کەسە من نیم. من چیم کردووە؟ ئەگەر کەسێک هەبێت لەو ڕۆژەدا یادی بکەمەوە، پێویستە ئەو کەسە بێت کە ئەو هەموو ساڵە خۆی کردۆتە فیدایم. پێویستە یادی دایکم بکەمەوە. هیچ زەحمەتییەکم نەکێشاوە تاکو لەدایک ببم. ئەوە خوێن و ئارەقە و فرمێسکی دایکم بووە ڕژاوە نەک من. پێویست ناکات چاوەڕێی ڕۆژی لەدایکبوونم بکەم (١٠ـی ئازار)، تاکو یادی دایکم بکەمەوە. دەمەوێت ساتێک تەرخان بکەم بۆ یادکردن و دەربڕینی

سوپاسگوزاری و پێزانینم بۆ دایکم، بەهۆی ئەو هەموو قوربانیدان و ئەرکەی لە ڕۆژی لەدایکبوونم و ڕۆژانی دواتردا، کێشاویەتی.

لە ڕاستیدا نامەوێت باسی یادی لەدایکبوون بکەم، وایە؟ نامەوێت پێتان بڵێم یادی لەدایکبوون حەرامە و چاولێکەری بێباوەڕانە. دەمەوێت شتێکی زۆر گەورەتر لەوەتان بۆ باس بکەم. لە فێرکردنی شەریعەتی ئیسلامدا لە شتێکدا بە هەڵەدا چووین. بە کورتی ئیسلاممان بچووک کردۆتە بۆ لیستێک شتی حەرام و لیستێک شتی حەڵاڵ. منداڵەکانمان فێر دەکەین لە بارەی ئاگری دۆزەخەوە، پێش ئەوەی تەنانەت بزانن بڵێن: (الرحمن الرحیم)، قوتابخانە بۆتە شوێنێک تاکو لێیەوە فێر بیت لە بارەی هەموو شتە حەرامەکان و ئەو سزایانەی تووشت دێن، ئەگەر ئەنجامیان بدەیت. کاتێک کەسێک دەبێتە مسوڵمان، یەکەمین شتێک پێی دەوترێت بریتییە لەوەی ناوی بگۆڕێت و چیدی یادی ڤالانتاین نەکاتەوە. ئێمە لە ڕووخسارەوە بەرەو ناخ هەنگاو دەنێین، لەبری ئەوەی لە ناخەوە بەرەو ڕووخسار بڕۆین. پێویستە لە خۆمان بپرسین پەیامبەرمان موحەممەد(ﷺ) چۆن ئەو کارەی دەکرد؟

یەکێک لە هاوەڵە بەڕێزەکان دەگێڕێتەوە عائیشەی دایکی ئیمانداران فەرموویەتی: ( ولو نزل أول شيء لا تشربوا الخمر لقالوا لا ندع الخمر أبدا ولو نزل لا تزنوا لقالوا لا ندع الزنا أبدا)، «ئەگەر یەکەمین شتێک لە ئاسمانەوە کە لە ڕێی وەحییەوە دابەزی بریتیبووایە لەوەی خواردنەوەی مەی و ئارەق حەرامە، خەڵکی دەیانوت هەرگیز دەستبەرداری مەی و ئارەق نابین. ئەگەر بوترایە زینا مەکەن، دەیانوت هەرگیز واز لە زینا ناهێنین.» (صحیح بوخاری).

هەروەها بەردەوام دەبێت لە ڕوونکردنەوەی ئەوەی سورەتەکانی سەرەتا باس لە ڕۆژی لێپرسینەوە و پەروەردگار دەکەن. ئایا دایکە

عائیشەمان لێرەدا مەبەستی چییە؟ دەستنیشانی ئەو هۆکارە دەکات بۆچی زۆرێک لە مسوڵمانانی ئەم سەردەمە دەڵێن دەستبەرداری خواردنەوە کحولییەکان، زینا، کێشانی نێرگەلە، یاخود وێنە ڕووتەکان نابین. هەرگیز واز لە ژوانبەستن و هەموو چێژ و خۆشییەکانی ژوان ناهێنین. ڕەتی دەکەینەوە دەستبەرداری ئەم کارانە ببین، چونکە لە بنچینە و دڵی ئیسلام تێنەگەیشتووین. چەندین ساڵە ئاگادار دەکرێینەوە لە بارەی «ڕێسای حەرامکراوەکانەوە»، وەلی هەرگیز ئاگادار نەکراوینەتەوە لە بارەی «ڕێسای دڵ».

پەیامبەری نازدار فێری کردووین بۆچی دەکەوینە داوی ئەو جۆرە تاوانانەوە و بەردەوام دەبین لە ئەنجامدانیان.

عن أبي عبدالله النعمان بن بشير رضي الله عنهما قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: ((إن الحلال بينٌ وإن الحرام بينٌ، وبينهما أمور مشتبهاتٌ لا يعلمهن كثيرٌ من الناس، فمن اتقى الشبهات استبرأ لدينه وعرضه، ومن وقع في الشبهات وقع في الحرام، كالراعي يرعى حول الحمى يوشك أن يرتع فيه، ألا وإن لكل ملكٍ حمًى، ألا وإن حمى الله محارمُه....))

باوکی عەبدوڵڵای کوڕی نوعمانی کوڕی بەشیر (خودا لێیان ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوە، پەیامبەر فەرموویەتی «بەڕاستی ئەوەی حەڵاڵە، ڕوون و ئاشکرایە و ئەوەی حەرام و قەدەغەیە بەرچاو و ڕوونە. لەنێوان حەرام و حەڵاڵەکانیشدا هەندێک شتی گوماناوی هەن، زۆرێک لە خەڵکی نازانن. ئەو کەسانەی خۆیان لە شتە گوماناوییەکان بە دوور دەگرن، خۆیان و ئاینەکەیان لە لۆمە دوور دەخەنەوە. ئەوەیشی دەکەوێتە نێو شتە گوماناوییەکانەوە، ئەوە دەکەونە نێو شتە حەرامەکانەوە هاوشێوەی شوانێک کە مەڕەکانی لە نزیک کێڵگەیەکدا دەلەوەڕێنێت و دەچنە نێو کێڵگەکەوە. ئاگادار

بن لەوەی هەموو پادشایەک سنووریکیان داناوە، پەروەردگاریش شتە حەرامکراوەکانی وەک سنووری خۆی دیاری کردووە.»

ئێمە لێرەدا دەوەستین، وەلێ فەرموودەکە ناوەستێت. ئەم فەرموودەیە بەوە دەست پێ دەکات خۆمان لە حەرامەکان بە دوور بگرین و پەیوەست بین بە حەڵاڵەکانەوە و ئێمەیش لەوێدا دەوەستین. فێر دەکرێین هەندێک شت هەن قەدەغە و حەرامن و لە لایەن مامۆستا و دایبابانمانەوە فەرمانمان پێ دەکرێت خۆمانیان لێ بە دوور بگرین. فەرموودەکە لێرەدا کۆتایی نایەت، کەچی ئێمە لێرەدا کۆتایی پێ دێنین. کۆتایی پێ دێنین لە «دوورکەوتنەوە لە شتە حەرام و گومان لەسەرەکان». پەیامبەرمان(ﷺ) لە فەرموودەکە بەردەوام دەبێت و پێمان دەفەرموێت، چۆن خۆمان بە دوور بگرین. چۆن خۆمان لە شتە حەرام و گومان لەسەرەکان بپارێزین؟ چۆن سنوورەکانی پەروەردگار بپارێزین و نەیبەزێنین؟ لە ڕێگای چاککردن و پاراستنی دڵمانەوە. فەرموودەکە بەردەوام دەبێت: «ألا وإن في الجسد مضغةً إذا صلَحت صلَح الجسد كله، وإذا فسدت فسد الجسد كله، ألا وهي القلب». «ئاگادار بن لە جەستەدا پارچە گۆشتێک هەیە، ئەگەر باش و چاک بێت، هەموو جەستە باش و چاک دەبێت، وەلێ ئەگەر خراپ بێت، هەموو جەستە خراپ دەبێت. ئاگادار بن ئەو پارچە گۆشتە بریتییە لە دڵ.»

دڵ سەرکردەی جەستەیە. دەبینیت مرۆڤایەتی واتە خۆشەویستی. گوێڕایەڵی ئەو شتانەین کە خۆشمان دەوێن. هەر شتێک دڵمان داگیر بکات، دەست بەسەر کردارەکانماندا دەگرێت. کاتێک دێتە باسی خۆشەویستی، دەڵێین زۆر شتمان خۆش دەوێت. وەلێ وەک شاعیری گەورە فەرموویەتی «خۆشەویستی هاوشێوەی کەسێکی یاسایی وایە، پێویستی بە بەڵگەیە.»

بەڵگەی خۆشەویستی چییە؟ دەرئەنجامی ڕاستەوخۆی ئەم هەستە بەهێزە چییە؟ بۆ ساتێک بیر لە خۆشەویستی مرۆڤ بکەرەوە. چی ڕوودەدات کاتێک کەسێک دەکەوێتە خۆشەویستی کەسێکی ترەوە؟ ئەو کەسە ئارەزووی هیچ شتێکی دی ناکات، جگە لە خزمەتکردن و ڕازیکردن و نزیکبوونەوە لەو کەسەی خۆشی دەوێت. ئەم خزمەتکردنە بەهۆی ناچارییەوە نییە، بەڵکوو بەهۆی پاڵنەرێکی قووڵی ناخەوەیە کە بەهۆی ئەو خۆشەویستییەوە سەری هەڵداوە.

خۆشەویستی بۆ خۆی دەدوێت. کاتێک کەسێکت خۆش دەوێت، هەموو شتێک دەکەیت بۆ ڕازیکردنی. گەورەترین دڵخۆشی تۆ، ڕازیکردن و خزمەتکردنی ئەوە. شانازییەکی گەورەیە خزمەتی ئەو کەسە بکەیت کە خۆشت دەوێت. بهێنە خەیاڵت کە لەگەڵ کەسێکی بەناوبانگدایت، دەزانم لە باشووری کالیفۆڕنیا نیت، وا دابنێ چاوت بە کۆب دەکەوێت، چۆن ڕەفتار دەکەیت؟ دەتوانم شتێکت بۆ بهێنم؟ پەرداخێک ئاو؟ دەتوانم قەیتانی پێڵاوەکانت توند بکەم؟ وا بهێنە پێش چاوت قەیتانی پێڵاوەکانی کۆب توند دەکەیت، پاشان دەگەڕێیتەوە ماڵەوە و بە هەمووان دەڵێیت «قەیتانی پێڵاوەکانی کۆبم توند کرد.»

ڕەنگە گرنگی بە کۆب نەدەیت، بەڵام لێرەدا لە مەبەستەکەم تێدەگەیت. شانازی و شەرەفێکی گەورەیە خزمەتی کەسێک بکەیت کە خۆشت دەوێت. وەلێ کاتێک خۆشەویستییەکە کاڵ دەبێتەوە و نامێنێت، خزمەتکردنی ئەو کەسە لە شانازی و شەرەفێکەوە دەبێتە بارگرانی. لە تەشریفەوە دەبێتە تەکلیف. بەداخەوە پەرستشمان بۆ پەروەردگار بەم شێوەیەی لێ هاتووە، تەنها بۆتە بارگرانی.

نوێژ ناکەین بۆ ئەوەی لە زریانەکانی دونیا ڕزگارمان بێت. ئەگەر

نوێژیش ئەنجام بدەین بۆ ئەوەیە لە کۆڵی خۆمانی بکەینەوە، یاخود دایک و باوکمان لێمان دەدەن، ئەگەر ئەنجامی نەدەین. تاڕادەیەک لە یادمان کردووە بە ئەنجامنەدانی نوێژەکانمان زیان بە کەس ناگەیەنین چ پەروەردگار، یاخود دایک و باوکمان، بەڵکوو زیان بە خودی خۆمان دەگەیەنین. دەبینیت لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا هەمووان بە تەنها لە بەردەم پەروەردگاردا دەوەستن و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت. کەس ناتوانێت هیچ کارێکت بۆ بکات، مەگەر بە مۆڵەتی پەروەردگار نەبێت. لەو ڕۆژەدا دایک کۆرپەکەی خۆی فڕێ دەدات، تەنها بۆ ئەوەی خودی خۆی ڕزگاری بێت. تکایە لەم حەقیقەتە تێبگەن کە لە یادمان کردووە، چونکە زۆر سەرقاڵ بووین بە مۆبایل، بەرنامەکان، هاوڕێ، ئاهەنگ و پۆست و پلەکانمانەوە. سەرقاڵ بووین بە پیاوانی قۆز و کەشخە و ئافرەتانی جوان و نازدارەوە. تکایە تێبگەن، فەرامۆشکردنی حەقیقەتێک نابێتە هۆی نەهێشتنی، ئەو حەقیقەتە هەر ڕوودەدات. ئامادەنەبوون بۆ شتێک نابێتە هۆی ئەوەی ڕوونەدات. ئەگەر تەواوی شەو ئاهەنگ بگێڕیت لەبری ئەوەی بۆ تاقیکردنەوەی کۆتایی بخوێنیت، مانای ئەوە نییە تاقیکردنەوەی کۆتایی ئەنجام نادرێت، بەڵکوو ئەنجام دەدرێت و لە ئەنجامدا شکست دێنیت. ئەگەر تەواوی ژیانمان بە ئاهەنگگێڕانەوە بەسەر بەرین و وا خۆمان دەرخەین کۆتاییمان نایەت، هەر ڕوودەدات. هیچ شتێک ناتوانێت مردن بوەستێنێت. هیچ شتێک ڕۆژی لێپرسینەوەی دواناخات. هاوشێوەی ئەو کۆتاییە، پرسیارەکە تەنها بریتییە لە: ئایا ئامادەین؟ یاخود زۆر سەرقاڵی ڕابواردن و کەیفخۆشین؟

بهێنە پێش چاوت لە هەواڵەکاندا باس لەوە دەکرێت زریانێکی گەورە بەڕێوەیە، ئەگەر خۆمان نەشارینەوە، خۆمان و خێزانەکانمان لەنێو دەچین. چی دەکەین؟ ئەگەر بەڕاستی بڕوامان وابێت زریانەکە

بەڕێوەیە، ڕاستەوخۆ دەچینە پەناگەیەک و خۆمان دەشارینەوە، وایە؟ تەنها ئەوانەی بڕوایان بە کەشوهەوا نییە، بەردەوام دەبن لە کەیف و خۆشی و ئەو هەموو هۆشدارییە فەرامۆش دەکەن. مەگەر ئەوەی بەڕاستی بڕوات پێ نەبێت، بەڵام چۆن دەکرێت کەسێک بزانێت زریانێک بەڕێوەیە و هیچ شتێک نەکات بۆ پاراستنی خۆیان و خۆشەویستانیان؟ ئایا کەس لەو کاتەدا دەڵێت «زۆر سەرقاڵی گەڕان و ڕابواردنم.»، «زۆر سەرقاڵی مۆبایل، یاخود فەیسبووکم تاکو ڕابکەم بۆ پەناگەیەک.»، یاخود «پێم خۆشە تەماشایەکی پرۆفایلی ئەم کەسە بکەم، نەک ئەوەی خۆم لەم زریانە بپارێزم.» هیچ کەسێک واناڵێت. کەچی هێشتا بەردەوام نوێژەکانت، حیجابپۆشین، وازهێنان لە ژوان، دوورکەوتنەوە لە کەسانی خراپ و خواردنەوەی مەی و ئارەق دوا دەخەیت. تۆ بەم کارانەت هەمان شت دووپات دەکەیتەوە.

ئەو حەقیقەتەی ناتوانین ئەم شتە حەرامانە واز لێ بێنین، بەردەوامین لە وتنی: «هەرگیز واز لە خواردنەوەی مەی و ئارەق ناهێنم». «هەرگیز دەستبەرداری زینا نابم.» «هەرگیز واز لە جگەرە و نێرگەلە و وێنەی ڕووت ناهێنم.» «هەرگیز واز لە ژوان و خۆشییەکانی ناهێنم.» و ئەو حەقیقەتەی پەرستشەکانمان تەنها دەبنە بارگرانی لە سەرمان، ئاماژەیەکن بۆ ئەوەی لە ناوەڕۆکدا هەڵەیەک هەیە. گرفتێک لە بیناییماندا هەیە. بەڕاستی زریانەکە نابینین کە دێت و ڕۆژی لێپرسینەوە نابینین. ئەو پارچە گۆشتەمان خاوێن و ڕاست نەکردۆتەوە کە پەیامبەر لە بارەیەوە دواوە. لە ئەنجامدا تەواوی جەستە و کردارەکانمان و ژیانمان خراپ و گەندەڵ دەبن.

بەڕاستی پەروەردگار بە چاوی دڵ نابینین و خۆشەویستی ئەومان لە ناخ و دڵماندا نەچاندووە. بەڕاستی دڵمان بۆ ئەو مەبەستە

تەرخان نەکردووە کە بۆی خولقێندراوە: بۆ ناسین و خزمەتکردن و خۆشویستنی پەروەردگار.

لە یادت بێت سورەتەکانی سەرەتا لەبارەی حەرام و حەلاڵەوە نەبوون. لە بارەی دوورکەوتنەوە لە ژوان، جگەرەکێشان، یاخود نێرگەلەکێشانەوە نەبوو، بەڵکوو لە بارەی ئەو ڕاستییەوە بوون، کە ڕۆژێک دێت چاومان بە پەروەردگار و خالقی خۆمان دەکەوێت، هەروەک چۆن من لە بەردەمتاندا وەستاوم. پاشان پرسیارمان لێ دەکرێت. لەم دونیایەدا چیتان خۆش ویست؟ ژیانتان لە چیدا بەسەر برد؟ بەدوای چیدا وێڵ و سەرگەردان بوون؟ ئایا ئەو شتەی هەوڵتان بۆی دەدا هەمیشەیی و نەبڕاوە بوو؟ ئەو شتانەی بەدوایدا ڕاتاندەکرد هەمیشەییبوون؟ ئایا دەتوانن یارمەتیتان بدەن، یاخود ئازارتان بدەن، کاتێک ژیانی دونیا و خەیاڵاتەکانی بە کۆتا هاتن؟

پێویستە بگەڕێینەوە لای پەروەردگار، پێش ئەوەی درەنگ بێت. زۆر جار ئەو شتەی خەڵکی نائومێد دەکات بۆ ئەوەی تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە ڕێی ڕاست، ئەوەیە بڕوایان وایە تاوانەکانیان زۆر گەورەیە و پەروەردگار نایانبەخشێت. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾ (الزمر: ٥٣-٥٤).

واتە: «بڵێ ئەی ئەو بەندانەی ستەم و زوڵمیان لە خۆیان کردووە بە ئەنجامدانی تاوان و گوناهی زۆر، لە ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار هیوابڕاو مەبن. پەروەردگار لە هەموو تاوانەکانتان خۆش دەبێت و هەر خۆی لێخۆشبوو و میهرەبانە (٥٣). بگەڕێنەوە لای پەروەردگار و تۆبە بکەن و ملکەچی بن، پێش ئەوەی سزای سەختی ئەوتان بۆ بێت لە دونیادا، هیچ کەسێکی دی ناتوانێت

سـەرتان بخـات. (٥٤)».

برایان و خوشکانی ئازیز، زریانەکە بەڕێوەیە. پەنا بە پەروەردگار بگرن. دەزانم لە ڕۆژی (١٠)ـی مانگی ئازار لە دایک بووم. دەزانین کەی لە دایک بووین، وەلێ کەس نازانێت کەی دەمرێت. زۆربەمان بڕوامان وایە دەتوانین بەو شێوەیە بژین کە دەمانەوێت، پاشان لە کاتی سەرەمەرگدا تەنها دەڵێین: «إنا لله وإنا إليه راجعون». لە کاتی سەرەمەرگدا زمان نایاتە گۆ، جگە لەو شتانەی دڵ فەرمانی پێ دەکات. ئەوەی لە دڵەکاندا بێت، دێتە سەر زار. ئەگەر لە ژیانماندا زیکر و یادی پەروەردگارمان نەکردبێت، چۆن لە سەرەمەرگدا یادی دەکەین؟ ئەگەر دڵەکانمان کەوتبێتە خۆشەویستی ئەم ژیانەوە؟

## داواکردنی پاداشت لە بەرامبەر خەڵاتەکەدا



بیهێنە خەیاڵت، خەڵاتێک وەردەگریت و هەرگیز سوپاسگوزار نابیت بۆی. بە تێپەڕینی کات لە یادی دەکەیت، خەڵاتەکەت پێ بەخشراوە و وا بیر دەکەیتەوە خەڵاتەکە لە بنەڕەتدا موڵکی خۆت بووە. پاشان خەیاڵاتەکان زیاتر دەبن. وا بیر دەکەیتەوە لە حەقیقەتدا تۆ خەڵاتەکەت بە بەخشەرەکە بەخشیوە. دواتر بە لەخۆباییەوە داوای پاداشت دەکەیت بۆ بەخشینی خەڵاتەکە. من و تۆ ئەم کارە لەگەڵ پەروەردگاردا دەکەین. خزمەتکردن و پەرستشی پەروەردگار بۆ تۆ گەورەترین خەڵاتە. کردەوە چاکەکانت خەڵاتێک نین کە بە پەروەردگاری ببەخشیت، وەلێ خەڵاتی پەروەردگارن بۆ تۆ. کەچی هێشتا داوای پاداشتی لێ دەکەیت. ئەگەر بتوانیت بە جوانی خزمەتی بکەیت و بیپەرستی، تەواو سوپاسگوزار بە، خاکی بە، نەک لەخۆبایی.

## نەخۆشی ئایدز: تێڕامان لە خەڵاتەکان



﴿ أَمَّنْ هَٰذَا الَّذِي يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُ ۚ بَل لَّجُّوا فِي عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴾ (الملک: ٢١). واتە: «ئایا جگە لە پەروەردگار کێ ڕزق و ڕۆزی ئێوە دەدات، ئەگەر ڕزق و ڕۆزیتان لێ بگرێتەوە؟ بەڵکوو ئەوان بەردەوام بوون و ڕۆچوون لە عینادی و لووتبەرزی و دوورکەوتنەوە لە حەقیقەت و ڕاستیدا.»

کاتێک بۆ یەکەمجار ئەم سورەتەم خوێندەوە، لە بەشی زیندەزانی دەمخوێند. فێر دەبووین لە بارەی ئەوەی چۆن سیستەمی بەرگری کار دەکات. ئەگەر بخوێنیتەوە لە بارەی ئەوەی چۆن نەخۆشی ئایدز کاریگەری دروست دەکات، نیشانە و بەڵگەیەکی گرنگە. نەخۆشی ئایدز کورتکراوەیە بۆ (نەخۆشی نەمانی بەرگری لەش). لەمە ڕابمێنە. کوشندەترین نەخۆشی بریتییە لە گرتنەوەی خەڵاتەکانی پەروەردگار، (سیستەمی بەرگری لەشمان). بەم چەشنە پەروەردگار دەتوانێت تەنها یەک جۆر خانەی بەرگری (تی ٤، خانەی یارمەتیدەر) وەربگرێتەوە و دواتر تەواوی سیستەمی بەرگری لەشمان تێکدەشکێت و نامێنێت. لەدوای ئەوە تەنها پەستانێکی سووک دەکرێت بمانکوژێت. سبحان الله. کێ دەتوانێت هاوکار و پاڵپشتمان بێت، ئەگەر پەروەردگار پشتیوانی و هاوکاری خۆیمان لێ ببڕێتەوە؟

# ژیانەوەی دڵە مردووەکان



﴿ أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلُ فَطَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَمَدُ فَقَسَتۡ قُلُوبُهُمۡۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ (الحديد: ١٦-١٧).

واتە: «ئایا ساتی ئەوە نەهاتووە باوەڕداران لە کاتی زیکر و یادی پەروەردگار و بیستن و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا دڵیان نەرم بێت، گوێڕایەڵ و ملکەچی ئەوە بن بۆیان دابەزیوە؟ وەک هەندێک لە جوولەکە و گاورەکان نەبن کە لە دواییدا دڵیان ڕەق بوو و زۆرێکیان دووڕوو بوون و لە ڕێی ڕاست دەرچوون. (١٦) بزانن پەروەردگار زەوی مردوو و وشک زیندوو دەکاتەوە و بارانی بە سەردا دەبارێنێت، بەو چەشنەش توانای زیندووکردنەوەی مردووەکانی هەیە و دوای دڵڕەقی، دەتوانێت دڵتان بە زیکر و یادی پەروەردگار و قورئانخوێندن نەرم بکاتەوە. بەو شێوەیە ئایەتەکانی خۆمانتان بۆ ڕوون دەکەینەوە تاکو تێبگەن و پەند و ئامۆژگاری وەرگرن.(١٧)»

پەروەردگار ئاگادارمان دەکاتەوە لەوەی هاوشێوەی قەومەکانی پێش خۆمان نەبین، کە سەرەتا ڕێنموییان وەردەگرت، وەلێ بە تێپەڕینی کات دڵەکانیان ڕەق دەبوو. سبحان الله لەدوای ئەو

هۆشداریدانەوە هیوا دەبەخشێت تەنانەت بەو کەسانەی دڵەکانیان ڕەق بووە. پەروەردگار یادمان دەخاتەوە کە ئەوە پەروەردگار خۆیەتی ژیان دەبەخشێتەوە بە خاکی وشکبوو. ڕەنگە ئیستا تێبفکرین: ئایا ئەو کەسەی ژیان دەبەخشێتەوە بە خاکی وشکبوو، ناتوانێت دڵە مردووەکان بژێنێتەوە؟ الله اکبر.

## ئەی عاشق



ئـەی پەرستشـكاری كـرداری، بزانـە پەرسـتش بێئاگایـی دڵ تەنهـا جووڵەیەكـە و هیچـی دی. ئـەی شـوێنكەوتەی زانسـت و زانیـاری، بزانـە زانسـت و زانیـاری بەبێ خاوێنبوونـەوە چەكێكـی كوشـندەی خۆپەرسـتییە. ئـەی چالاكـوان، بزانـە كار بـێ خاوێنكردنـەوەی دڵ بێبەرهەمـە. ئـەی عاشـق، بزانـە خۆشـەویسـتی بـێ پـەروەردگار تەنهـا ئێـش و ئـازارە.

## زەلکاو



ئەگەر نائومێدی تاکە ڕێگا بێت
بۆ ئەوەی بێمە سەرچۆك
بەڕووی تۆدا بکرێمەوە
ئەوکات ئەم ئازارە
دەبێتە پەسەندترین شوێنی من
ڕۆمی وتی: «برینەکە مەدوورەوە
چونکە ڕووناکی لەوێوە دێتە ژوورەوە.»
و باوەڕم بەوە هەیە.
کاتێك ئاوازەکان بەرز دەبن و جوانییەکانی ئەم ژیانە
خامۆش دەبن لە شوێنی خۆیاندا
کاتێك بەتاڵ دەبم
یادت دەکەم
فرمێسکەکان دروست دەبن، بەهۆی ئەو یادەوەریانەی لەگەڵیدان
خەمەکانم سەرسینگم قورس دەکەن
بەلەمەکەم لەم زەلکاوەدا دەسووڕێنم

بەنێو درەختەکاندا دەخزێم
ڕووبەڕووی ئاوێکی ڕەش و تەنك دەبمەوە
چاوەڕێی ڕووناکییەکەم ڕێنوێنیم بکات
هیوادارم لەوێدا بمێنمەوە
تاکو جارێکی دی من بدۆزیتەوە.

# مانگی ڕەمەزان: بارینی بارانی ڕەحمەت



بۆ ساتێک بهێنە پێش چاوت کاتێک باران دەبارێت و لە ژوورەوەیت تەماشای بارانەکە دەکەیت، وەلێ شتێکی زۆر جیاواز لەم بارانەدا بەدی دەکەیت. هاوشێوەی بارانەکانی پێشووتر نییە. لەم ڕۆژەدا بارانی ئاو نییە کە دەبارێت، بەڵکوو بارانی شتێکی زۆر بەهادارترە بۆت. وا دابنێ لەم ڕۆژەدا سەدان چەکی پارە دەبارێت. چی دەکەیت؟ لەو ڕۆژەدا چی لە دەوروبەرت و جیهاندا دەگوزەرێت؟ ئایا ناچینە دەرەوە و ناکەوینە خۆمان و کێبڕکێ ناکەین زۆرترین پارە بەدەست بهێنین کە باریوە؟ ئایا بە شەویشدا لە دەرەوە نامینینەوە تاکو زیاتر کەڵەکە بکەین؟ ئەمە دەکەین لەپێناو پارەدا، چونکە پارە شتێکی بەهادار و بەنرخە. بۆ ساتێک وای دابنێ شتێکی زۆر زۆر بەنرخ و بایەخدار دەبارێت کە نە هەزاران چەکی پارەیە و نە ترێلۆنێکە، بەڵکوو ڕەحمەتی پەروەردگاری مەزنە، دراوێک کە ناتوانرێت بە هیچ دراوێکی مرۆڤ بخەملێنرێت.

پەیامبەر موحەممەد(ﷺ) فەرمووی: «أتاكُمْ رمضانُ، شهر بركةٍ يغشاكُمُ اللهُ فيه، فيُنزِّلُ الرَّحمةَ، ويحُطُّ الخطايا، ويستجيبُ فيه الدعاءَ، ينظرُ اللهُ إلى تنافُسِكُمْ فيه، ويُباهي بكُمْ ملائكتَهُ، فأرُوا اللهَ منْ أنفُسِكم خيراً، فإنَّ الشقيَّ منْ حُرِمَ فيه رحمةَ اللهِ». واتە: «ڕەمەزان

بوو بە میوانتان، مانگێکە پڕە لە ڕەحمەت کە تێیدا پەروەردگار بە ڕەحمەتی خۆی داتدەپۆشێت. ڕەحمت پێ دەکات، تاوانەکان کەم دەکاتەوە و وەڵامی نزاکانت دەداتەوە. لە مانگی ڕەمەزاندا پەروەردگار تەماشای کێبڕکێکەتان دەکات لە ئەنجامدانی کردەوەی چاکەدا و لای فریشتەکان ستایشتان دەکات. کەواتە چاکەی خۆت بنوێنە، بێبەخت کەسێکە لەم مانگەدا لە ڕەحمەتی پەروەردگار بێبەش دەبێت.» (الطبرانی).

لەم مانگە پیرۆزەدا دەپارێزرێین لە ئاگری دۆزەخ و شەیتان و تاوانەکانمان دەسڕێنەوە. پەیامبەری نازدار(ﷺ) فەرموویەتی: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ». واتە: «هەر کەسێک لە مانگی ڕەمەزاندا بەڕۆژوو بێت و بە هیوای بەدەستخستنی پاداشتی پەروەردگار بێت، پەروەردگار هەموو تاوانەکانی دەسڕێتەوە و لێی خۆش دەبێت.» (بوخاری).

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: «إذا جَاءَ رَمَضَانُ، فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الجنَّةِ، وغُلِّقَت أَبْوَابُ النَّارِ، وصُفِّدت الشياطِينُ». واتە: «کاتێک مانگی ڕەمەزان دەست پێ دەکات، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە و دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیتانەکان زنجیر دەکرێن.» (ئیمامی بوخاری).

کەواتە چی خەسارەتمەندییەک گەورەترە لەوەی لە ناوەڕاستی ڕەحمەتەکانی پەروەردگاردا بین، بەبێ ئەوەی بەدەستیان بهێنین؟ لە کاتێکدا ئەم بارانی ڕەحمەتە لەم مانگەدا بەسەرماندا دەبارێت، دە ڕۆژی کۆتایی هاوشێوەی ڕۆژەکانی تری نییە. عائیشەی دایکی ئیمانداران، (خودا لێی ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوە: «كان النبي صلى الله عليه وسلم إذا دخل العشر شد مئزره وأحيا ليله وأيقظ أهله». واتە: «بە هاتنی دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان، پەیامبەرمان(ﷺ) قایشەکەی پشتی

توند دەکرد و باش تێدەکۆشا و تەواوی شەوەکان شەونوێژی دەکرد و هاوسەرەکانی بۆ شەونوێژ بەئاگا دەهێنایەوە.» (بوخاری).

بەڵام چۆن بتوانین تەواو سوود لەم مانگە پڕ ڕەحمەتە وەربگرین، بەتایبەت لە دە ڕۆژی کۆتاییدا؟ لە خوارەوە چەند ڕێگایەک ئاماژەیان پێ دراوە:

## کاتێکی تایبەت تەرخان بکە بۆ هاودەمیی پەروەردگار

کاتێک دیاری بکە جا پێش پارشێو، یاخود دوای پارشێو تاکو لەگەڵ پەروەردگاردا بیت. ئەم کاتە تەرخان بکە بۆ پەیوەستبوون بە پەروەردگارەوە لە ڕێی نوێژکردن و نزاکردن و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزەوە. پەیامبەر(ﷺ) دەفەرموێت: «ينزل ربنا تبارك وتعالى إلى السماء الدنيا كل ليلة حين يبقى ثلث الليل الآخر فيقول: من يدعوني فأستجيب له، من يسألني فأعطيه، من يستغفرني فأغفر له، حتى ينفجر الفجر.» واتە: «کاتێک سێیەکی شەو دێت، پەروەردگاری باڵادەست دێتە ئاسمانی یەکەم و دەفەرموێت: ئایا کەس هەیە داوام لێ بکات تاکو پێی ببەخشم؟ ئایا کەس هەیە داوای یارمەتیم لێ بکات و یارمەتی بدەم؟ ئایا کەس هەیە داوای لێخۆشبوون بکات، تاکو لێی خۆش ببم؟» (بوخاری و موسلیم).

## ساتێك دیاری بکە بۆ تێڕامان و بیرکردنەوە

لە ناوەڕاستی جەنجاڵییەکانی ژیاندا بە دەگمەن کات دەدۆزینەوە تاکو بوەستین و پشوویەک بدەین، چ جای ئەوەی لە ڕاستییەکانی ژیان ڕابمێنین. کاتێک تەرخان بکە بۆ تێڕامان لەمە و دەرچوون لە ڕۆتینیاتی ڕۆژانەت و بیرکردنەوە لەوەی لە کوێیت و بۆ کوێ دەڕۆیت. بیر لە دروستکراوەکانی چواردەورت، حەقیقەتی ئەم

ژیانە، مردن و دیدارمان لەگەڵ خالقدا بکەرەوە. کاتێکی هاوشێوەی سێیەکی کۆتایی شەو تەرخان بکە، کە هیچ شتێک خەیاڵ و بیرکردنەوەت نەشێوێنێت.

## گەشتێك بەرەو پەروەردگار ئەنجام بدە

هەموومان پێویستمان بە ئەنجامدانی گەشت هەیە. ڕەمەزان بەکار بێهنە وەکو دەرفەتێک بۆ ئەوەی گەشتێک لەگەڵ پەروەردگاردا بکەیت. عائیشە گێڕاویەتیەوە پەیامبەر(ﷺ) ڕاهاتبوو لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا اعتکاف ببەستێت و دەیفەرموو: «ئاگاتان لە دە شەوی قەدر بێت، لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا.» (بوخاری).

## شەوی قەدر لەدەست مەدەن

شەوێک هەیە لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا، گەورەتر و خێرتره لە هەزار مانگ. پەیامبەر(ﷺ) فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە شەوی قەدردا نوێژ بکات و بە ئومێدی بەدەستهێنانی پاداشتەوە بێت، لە هەموو تاوانەکانی پێشووی دەبەخشرێت.» (بوخاری و موسلیم).

عائیشەی دایکی ئیمانداران فەرمووی: «پرسیارم لە پەیامبەر(ﷺ) کرد: ئەی پەیامبەری خودا، ئەگەر بزانم ئەو شەوە شەوی قەدرە، چی نزایەک بکەم لەو شەوەدا؟ پەیامبەری نازدار(ﷺ) فەرمووی: «اللهم انك عفوا كريم تحبوا العفو فعفو عنا.» (ئیمامی ئەحمەد، ابن ماجە، ترمزی).

# بەردەوامبوون لە هەڵگرتنی مەشخەڵی ڕەمەزان



مانگی ڕەمەزان تێپەڕی، قورئانەکانمان داخران، مزگەوتەکانمان چۆڵ کران، دڵەکانمان جارێکی تر پڕ بوون لە خۆشەویستی دونیا و ڕقلێبوونەوە لە مردن و هەوا و ئارەزووەکانمان تەواو کۆنترۆڵیان کردووین. شەیتان کە زنجیر کرابوو، جارێکی دی لە مێشک، ماڵ و چواردەورماندا شوێنی خۆی گرتەوە. جارێکی دی پەیمانەکەی خۆی پاراست، کە فریومان بدات.

﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ (الاعراف: ١٦-١٧).

واتە: «ئیبلیس وتی: پەروەردگار بەهۆی ئەوەی تۆ منت گومڕا کرد، دەبێت لەسەر ڕێگە ڕاستەکەی تۆ دانیشم و خەڵکی گومڕا بکەم(١٦). پاشان دەبێ لە پێشەوە بۆیان بێم و هانیان بدەم بۆ دونیا و بە دوایانەوە گومانیان بۆ دروست دەکەم سەبارەت بە قیامەت. لای ڕاستیانەوە سستیان دەکەم لە چاکە کردن و لای چەپیانەوە خراپە و تاوانیان بۆ دەڕازێنمەوە. هەموو ڕێگایەک دەگرمە بەر بۆ گومڕاکردنیان. دەبێت زۆر کەمیان ببینیت شوکرانەت بکەن و زۆریان گومڕا بەکەم.(١٧)»

کاتێک خۆمان بە لاوازی بینییەوە لەبەردەم ئەو ململانێیانەی پێش ڕەمەزان تووشمان هاتن. با مەبەستی هەوڵەکانمان لە ماوەی مانگی

ڕەمەزاندا لە یاد نەکەین، با ڕێگە نەدەین بەرهەمەکانی ڕەمەزانمان لە دەست بچێت. با مەبەستی سەرەکی ڕۆژووگرتنەکەمان لە یاد نەچێتەوە. کاتێک پەروەردگار فەرمان بە بەندەکانی دەکات بەڕۆژوو بن، دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَآ أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُ ۗ قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾ ﴾ (ال عمران: ١٨٣).

واتە: «جوولەکەکان بە درۆ دەیانوت: پەروەردگار پەیمانی پێمان داوە ئیمان بە هیچ پەیامبەرێک نەهێنین تاکو خێر نەکەین و ئاگر لە ئاسمانەوە نەیەت، ئەو خێرە بسووتێنێت. ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: لەپێش منیشەوە چەندین پەیامبەری تر هاتن بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکراوە، بەوەش کە خۆتان دەیڵێن لە بارەی خێر و ئاگرەکەوە، بۆچی ئیمانتان نەهێنا و کوشتتانن، ئەگەر ڕاست دەکەن؟»

ئاگاداربوون لە پەروەردگار بۆ تەواوکردنی مەبەستی بوونمان لەم ژیانەدا، گرنگە. ترس لە پەروەردگار یارمەتیمان دەدات لەسەر ڕێگا ڕاستەکە بەردەوام بین. ئەگەر تەقوا ماسوولکەمان بێت، ڕەمەزان ڕاهێنەری تایبەتیمانە. ئەگەر لە ماوەی ڕەمەزاندا بتوانین خۆمان لە پێویستییە جەستەییەکانمان وەکو خواردن و خواردنەوە بگرینەوە بەهۆی ترسمان لە پەروەردگار، ئایا ناتوانین دوای ڕەمەزان بەهۆی هەمان ترسەوە خۆمان لە حەرامەکان بپارێزین؟کاتێک بەڕۆژووین، کەسمان ناتوانین پەرداخێک ئاو بەدزییەوە بخۆینەوە، هەمان ئەو خودایەی لە مانگی ڕەمەزاندا ئاگادارە بە خواردنەوەی پەرداخێک ئاو بە دزییەوە، دەتوانێت دوای مانگی ڕەمەزانیش بمانبینێت کاتێک تاوان ئەنجام دەدەین.

لە کاتی ڕەمەزاندا پێش خۆرهەڵاتن لە خەو هەڵدەسین تاکو خواردن و خواردنەوە بدەینە جەستەمان، وەلێ لە دوای مانگی ڕەمەزاندا لە ساتی نوێژی بەیانیاندا دەخەوین و ڕۆحمان بە برسێتی

دەمێنێتەوە. با ڕێگە نەدەین جارێکی تر ببەزین. شەیتان دووبارە بانگمان دەکاتەوە و وەسوەسەمان بۆ دروست دەکات، ئەو تەنها دەتوانێت وەسوەسەمان بۆ دروست بکات، هێز و بڕاردە لە دەستی خۆماندایە. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا پێمان دەفەرموێت:

﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِي ۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ ۖ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ (ابراهيم: ٢٢).

واتە: «شەیتان بە دۆزەخییەکان دەڵێت: بەڕاستی بەڵێنی پەروەردگار بەڵێنێکی حەق و ڕاست بوو، منیش بەڵێنی پووچ و ناڕاستم پێ دان. من لێرە هیچ توانا و دەسەڵاتێکم نییە، تاکو ڕزگارتان بکەم، یاخود لە دونیاشدا توانا و دەسەڵاتم نەبوو، من تەنها بانگم دەکردن بۆ خراپەکاری و ئێوەش وەڵامتان دەدامەوە، بۆیە لۆمەی من مەکەن و لۆمەی خۆتان بکەن. نە ئێوە دەتوانن فریام بکەون و نە منیش دەتوانم فریاتان بکەوم. من بێباوەڕم و نکوڵی لەوە دەکەم ئێوە منتان کردە هاوبەشی پەروەردگار. پەروەردگار دەفەرموێت، کە هاوبەشدانەران و ستەمکاران سزای بەئێش و ئازاریان بۆی هەیە.»

هەندێک کەس هەن ڕێگە بە شەیتان دەدەن کۆنترۆڵیان بکات، وەلێ هەندێکی تر هەن شەیتان هیچ دەسەڵاتێکی بە سەریاندا نییە. پەروەردگار بە شەیتان دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾(الحجر: ٤٢). واتە: «بە دڵنیاییەوە دەسەڵات و توانات بەسەر بەندە دڵسۆز و هەڵبژێردراوەکانمدا نییە، تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە خۆیان شوێنی تۆ بکەون و لە گومڕاییدا بن.»

چۆن بتوانین لەو بەندانە بین شەیتان هیچ دەسەڵاتێکی بە

سەریانەوە نییە؟ چۆن بتوانین تەواوی ساڵەکە و تەواوی ژیانمان بە هەمان گەرموگوڕی و ڕۆحیانەتی مانگی ڕەمەزانەوە بەردەوام بین؟ ئەم چەند ڕێگایەی خوارەوە بگرە بەر:

**یەکەم/ ئاگاداری نوێژکانت بە:**

لە مانگی ڕەمەزاندا زۆرێکمان دڵنیایی دەدەینەوە لەوەی نوێژەکانمان لە کات و ساتی خۆیاندا و زۆر جار بە کۆمەڵ لە مزگەوتدا ئەنجام بدەین، بەردەوام بە لە ئاگاداربوون لە نوێژەکانت، چونکە بە دڵنیاییەوە نوێژەکانت دەتپارێزن و ئاگادارت دەبن. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت ﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾. (العنكبوت: ٤٥) .

واتە: «ئەی موحەممەد(ﷺ)، ئەوەی بە وەحی بۆت دابەزیوە لە قورئانی پیرۆز بۆ خەڵکی بخوێنەوە و نوێژەکانت ئەنجام بدە، بە دڵنیاییەوە نوێژ ڕێگری لە خراپە و تاوان دەکات، زیکر و یادی پەروەردگار لە هەموو پەرستشێک گەورەترە، پەروەردگار خۆی زانایە بە کردەوەکانتان.».

**دووەم/ زیکر و یادی پەروەردگار بکە بە نزیکبوونەوە و هاودەمی قورئانی پیرۆز:**

لە کاتی ڕەمەزاندا زۆرێکمان شەو و ڕۆژ لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا بەسەر دەبەین. زیکر و یادی پەروەردگار بە هاودەمی قورئان لە شەیتان دەتپارێزێت و دڵت پاک و بێگەرد ڕادەگرێت. پەیامبەر موحەممەد(ﷺ) دەفەرموێت: «پاکوخاوێنی هەیە بۆ هەموو شتێک کە خەوش و پیسی دەگرێت. پاک و بێگەردی دڵ

بـە زیکـر و یـادی پـەروەردگار دەبێـت.» (بوخـاری).
هەروەهـا فەرموویەتـی: «تعلّمـوا القرآن فإنّه شـافع لأصحابه يوم القيامة».
واتە: «قورئان بخوێنن، چونکە بەڕاستی لە ڕۆژی لێپرسنەوەدا دەبێتە شەفاعەتکار و تکاکار بۆ خاوەنەکەی.» (موسلیم).

## سێیەم/ زیاتر بیر بکەرەوە و کەمتر بدوێ:

پەیامبەری نازدار (ﷺ) فەرموویەتی: «هەندێک جار کەسێک شتێک دەڵێت بە هۆیەوە پەروەردگار لە خۆی ڕازی دەکات و پەروەردگار پلەی بەرز دەکاتەوە. هەندێک جار کەسێک شتێک دەڵێت پەروەردگار لە خۆی دەڕەنجێنێت و بەرەو ئاگری دۆزەخی دەبات.» (بوخاری).
ئیبراهیم النخاعی، کە پیاوچاکێکی خواپەرست بووە، فەرموویەتی: «ئەوەی کەمێک ڕابمێنێت، بۆی دەردەکەوێت باشترین و ژیرترین کەس لە کۆبوونەوەکاندا کەسێکە لە هەمووان بێدەنگترە، چونکە بێدەنگی شکۆ و جوانی بە زانایان دەبەخشێت و هەڵە و کەموکورتی نەزانان دەپۆشێت.»

## چوارەم/ زۆر تۆبەکردن:

زۆرێکمـان لـە مانگـی ڕەمەزانـدا داوای لێخۆشـبوون لـە پـەروەردگاری مـەزن دەکەیـن، وەلـێ دوای مانگـی ڕەمـەزان واز لـە تۆبەکردن و داواکردنی لێخۆشبوون دەهێنین. لە یادت بێت پەیامبەر ڕۆژانە سەدان جار تۆبەی دەکرد. زۆر تۆبەکردن دڵەکانمان پاک و بێگەرد ڕادەگرێت و هەمیشە پەیوەستمان دەکات بە پەروەردگارەوە.
هاوڕێیەکـی خۆشەویسـتم وتـی: بـە تێپەڕبوونـی مانگـی ڕەمـەزان هەمـووان وا هەسـت دەکـەن خـزم و دۆسـتێکیان لـە دەسـت داوە. وتەیەکـی زۆر دروسـتە. بـا ئێمـە هـەوڵ بدەیـن ڕۆیشـتنی ڕەمـەزان بەفیـڕۆ نەدەیـن و سـوودی لـێ وەرگریـن.

# ژوانبەستن



**پرسیار:** ئایا ژوانبەستن لە ئیسلامدا ڕێپێدراوە بۆ ئەوەی کەسێک بناسم بە مەبەستی هاوسەرگیری؟ لە کاتێکدا زۆر سەختە هاوسەرگیری بکەیت و ژوانبەستن ئاساییە لە کۆمەڵگاکەماندا. لەم سەردەمەدا هاوسەرگیری ڕێکخراو باو نییە لە نێوانماندا.

**وەڵام:** السلام علیکم برای بەڕێزم، سوپاس بۆ پرسیارە ڕاشکاوانەکەت لەبارەی ژوانبەستنەوە. چەند باسێکی گرنگت ورووژاند.

**یەکەم:** ئاماژەت بەوە دا لە کۆمەڵگەیەکدایت ژوانبەستن تێیدا ئاساییە، لەو گرفتە تێدەگەم، وەلێ گرنگە بزانیت تەنها بەهۆی ئەوەی شتێک باوە و ئاساییە لە کۆمەڵگەیەکدا، نابێتە بەهانە بۆ بەشداریکردن تێیدا. لەو کۆمەڵگەیەی پەیامبەری نازدار(ﷺ) تێیدا ژیاوە، زیندەبەچاڵکردنی کچان باو بوو. بە دڵنیاییەوە شەریعەتی ئیسلام ئەم جۆرە کردەوە دڕندانەیەی قەدەغە کرد و گرنگ نەبوو لەو کاتەدا چی باوە. لە ڕاستیدا پەیامبەرمان(ﷺ) پێی فەرمووین ئەوانەی شوێنی ڕێگای ڕاست و حەقیقەت دەکەون، هەمیشە جیاواز و نامۆ دەبن لەوانی دی. لە فەرمایشتێکی پیرۆزدا پەیامبەر موحەممەد(ﷺ) دەفەرموێت: (بدأ الإسلام غريباً وسيعود غريباً كما بدأ

فطوبی للغرباء. قیل: یا رسول الله! من الغرباء؟ قال: الذین یصلحون إذا فسد الناس). واتە: «ئیسلام بە غەریبی دەستی پێ کرد و لە کۆتاییشدا غەریب و نامۆ دەبێتەوە، خۆشبەختی بۆ غەریبان و نامۆیان. پاشان لێیان پرسی: ئەی پەیامبەری خودا(ﷺ) ئەو غەریب و نامۆیانە کێن؟ وەڵامی دایەوە: ئەوانەن خواپەرست و چاکەکارن، لە کاتێکدا خەڵکانی تر خراپەکارن.» (ئیمامی ئەحمەد).

**دووەم:** باست لە ناسینی کەسێک کرد بۆ مەبەستی هاوسەرگیری. ڕوونت کردەوە ژوانبەستن پێویستە، چونکە هاوسەرگیری ڕێکخراو ئێستا باوی نەماوە. لەگەڵ ئەوەیشدا بە وتنی ئەوە ئاماژەت بەوە دا، تەنها ئەو دوو ڕێگایە هەیە بۆ هاوسەرگیریکردن. ئەوەی لە یادت کردووە ئەوەیە بژاردەی سێیەم هەیە. ئەو بژاردەیەی لە لایەن پەیامبەری خۆشەویستەوە(ﷺ) فێر کراوین. با لێکۆڵینەوە لە هەرسێ ڕێگاکە بکەین بۆ ناسینی هاوسەر و هاوبەشی ژیانمان:

## یەکەم/ ژوانبەستن

یەکێک لە بژاردەکان، بریتییە لە ژوانبەستن. ئەم بژاردەیە بەهۆی چەند هۆکارێکەوە قەدەغە کراوە. یەکەم، پەیامبەری نازدار(ﷺ) فێری کردووین، حەرام و ڕێنەدراوە بۆ دوو کەسی نامەحرەم بە تەنها پێکەوە بن. ئەمە پێی دەوترێت خەڵوەت. پەیامبەر(ﷺ) ئاگاداری کردووینەتەوە لەوەی ئەگەر دوو کەس پێکەوە خەڵوەت ببەستن، شەیتان دەبێتە سێیەمیان. پەیامبەر موحەممەد(ﷺ) فەرموویەتی: «ألا لایخلون رجل بامرأة إلا کان ثالثهما الشیطان.» واتە: «کاتێک پیاوێک بە تەنها لەگەڵ ئافرەتێکدا دەبێت، شەیتان دەبێتە سێیەمیان.» (صحیح بوخاری).

زۆر گرنگە پەروەردگار هیچ شتێک قەدەغە ناکات، مەگەر ئەوەی زەرەر و زیانی هەبێت بۆمان. با لێکۆڵینەوە لە حەرامی ژوانبەستن بکەینەوە:

ڕاپۆرتەکان دەریدەخەن زۆرێک لە دەستدرێژییە سێکسییەکان لە لایەن کەسانی غەریبەوە ئەنجام نەدراون. لە ڕاستیدا بەپێی نووسینگەی دادپەروەریی ئەمریکا (٦٨٪)ـی کچانی گەنج، پێشتر ئەو کەسانەیان ناسیوە کە دەستدرێژییان کردۆتە سەریان، خۆشەویست، هاوڕێ، یاخود دۆستێکیان بوون. (٦٠٪)ـی کچانی گەنج لە ماڵی خۆیاندا، یاخود ماڵی هاوڕێ و خزمێکیاندا دەستدرێژییان کراوەتە سەر، نەک لە کۆڵانە تاریکەکاندا. بە گشتی ئەو کەسانەن لەگەڵیاندا دەچیتە جێژوان کە ئەو تاوانانە ئەنجام دەدەن. کاتێک ژوانبەستن لە کۆمەڵگایەکدا زۆر ئاسایی و بەربڵاو دەبێت، بە هەمان شێوە دووگیانی نەویستراو و نەخۆشییە گوازراوەکانیش بەربڵاو دەبن. بە ڕێگریکردن لە خەڵوەت، پەروەردگاری دانا و زانا ئێمە دەپارێزێت.

هەروەها دەزانیت زینا لە ئیسلامدا تاوانێکی گەورەیە، بەڵام پەروەردگار تەنها پێمان ناڵێت: زینا مەکەن، بەڵکوو لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویت: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾ (الإسراء: ٣٢)، واتە: «نزیکی زینا مەکەون، چونکە تاوانێکی گەورەیە و خراپە و دەروازەیەکە بۆ خراپەکاریی دی.»

کەس منداڵەکەی لەسەر شەقامێک جێناهێڵێت، یاری بکات و هیوادار بێت ئۆتۆمبێل لێی نەدات. یەکێک لە ڕێسا گرنگەکانی ئیسلام، بریتییە لە: پاراستن پێش چارەسەرکردن. نزیکی ئاگر ناکەویتەوە و دواتر بپرسیت بۆچی سووتاویت. پەروەردگار هەموو شتێکی قەدەغە کردووە، کە بەرەو زینات دەبات، بە تایبەتی خەڵوەتبەستن. کەواتە ئەگەر خەڵوەت ڕێنەدراو بێت، دەبێت چی بوترێت لە بارەی پەیوەندی جەستەیی و ژوانبەستنەوە؟

ڕەنگە بوترێت ژوانبەستن گرنگ و پێویستە بۆ دۆزینەوەی هاوسەر

و هاودەمێک. باسەکە ئەوەیە ژوانبەستن نابێتە هۆی زیادکردنی ڕێژەی سەرکەوتنی هاوسەرگیرییەکە. لە ڕاستیدا ژوانبەستن لە کولتووری ئەمریکادا باو و ئاساییە، وەلێ بەپێی جێنیفەر بەیکەری پەیمانگای فۆرێست بۆ دەروونناسی (٥٠٪)ـی هاوسەرگیری یەکەم، (٦٧٪)ـی هاوسەرگیری دووەم و (٧٤٪)ـی هاوسەرگیریی سێیەم، بە جیابوونەوە کۆتایی دێت. هەروەها بەپێی نووسینگەی نیشتیمانی توێژینەوەی ئابووری، ئەو خۆشەویستانەی پێش ئەنجامدانی هاوسەرگیری پێکەوە ژیاون (٨٠٪) ڕێژەی جیابوونەوەیان زیاترە لەوانەی پێش هاوسەرگیری پێکەوە نەژیاون. کەواتە ئەگەر ژوانبەستن ببێتە هۆی زیادکردنی ئەگەری دەستدرێژی سێکسی، نەخۆشییە گوازراوەکان، دووگیانی نەویستراو، یارمەتیت نەدات لە دۆزینەوەی هاوسەرێکی باش و سەرکەوتوودا، چی کەسێکی خاوەن ژیری ئەم بژاردەیەی هەڵدەبژارد؟ تەنانەت ئەگەر لە لایەن شەریعەتی ئیسلامیشەوە قەدەغە نەکرابا؟

## دووەم/ هاوسەرگیری ڕێکخراو

هەروەها بژاردەیەکی تر هەیە بریتییە لە هاوسەرگیری تەواو ڕێکخراو. هەرچەندە شتێکی باش و ئاساییە دایبابان، یاخود هاوڕێی گیانی بە گیانی دوو هاوسەر بە یەک بناسێنن و بە یەکیان بگەیەنن، پەیامبەرمان(ﷺ) پێی فەرموویە: کوێرانە نەچینە نێو کەژاوەی هاوسەرگیرییەوە. جارێکیان پیاوێک هات بۆ خزمەتی پەیامبەری نازدار(ﷺ) و پێی وت: دەیەوێت هاوسەرگیری بکات، پەیامبەر(ﷺ) پرسی ئایا ئافرەتەکەت بینیوە؟ کاتێک پیاوەکە وتی: نەخێر. پەیامبەر(ﷺ) فەرمووی: بڕۆ و تەماشای بکە، تاکو خۆشەویستی بکەوێتە نێوانتانەوە. (ئیمامی ئەحمەد).

## سێیەم/خوازبێنی ئیسلامیانە

ئیسلام چارەسەرێکی نێوەندی داناوە بۆ خوازبێنی، کە تاکەکان و کۆمەڵگەش دەپارێزێت، بەڵام ناهێڵێت خەڵکی بە شێوەیەکی کوێرانە پەیوەندی هاوسەرگیری ببەستن. ئەگەر ئافرەتێک هەبێت بتەوێ هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەیت، پێویستە بچیت بۆ لای کەسە مەحرەمەکانی. بەم شێوەیە چەندین دەروازە دەبێت تاکو لە ڕێیەوە باشتر بیناسیت، بێ ئەوەی بچنە جێژوان، یاخود پەیوەندی جەستەییتان هەبێت. قسەکردن لە ڕێی تەلەفۆن، ئیمێڵ، یاخود ئینتەرنێتەوە، یاخود هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کەسێکی مەحرەمیدا دەرفەتێکی باشت بۆ دەڕەخسێنێت تاکو زیاتر لە بارەیانەوە بزانیت، بەبێ ئەوەی ئەو سنوورانە ببەزێنیت کە پەروەردگاری زانا و دانا دایناوە. پەیامبەرمان موحەممەد(ﷺ) فەرموویەتی: «من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يخلون بامرأة ليس بينها وبينه محرم.». واتە: «ئەی ئەوانەی باوەڕتان بە پەروەردگار و ڕۆژی دوایی هەیە، هیچ ژوانێک لەگەڵ ئافرەتێکی نامەحرەمدا مەبەستن، بەبێ ئامادەبوونی کەسێکی مەحرەمی.» (ئیمامی ئەحمەد).

**پەروەردگاری مەزنیش زاناترە بە شتەکان. نزام وایە ئەوەی نووسیومە، سوودیان هەبووبێت. ئەوەی بەڕاستی و دروستی وتوومە لە لایەن پەروەردگارمەوەیە. هەر هەڵە و کەموکورتییەکیش هەبێت ئەوا لە خۆمەوەیە.**

# ئایا گرووپی میلشیای هوتاری نوێنەری مەسیحییەتن؟



نۆ ئەندامی گرووپێکی میلشیای مەسیحی (هوتاری)، ڕۆژی دووشەممە تۆمەتبار کران بە پلاندانان بۆ کوشتنی ئەفسەرێکی پۆلیس، لە ڕێی بۆمبی دەستکردەوە. بەپێی بەڵگەکان کردەوەکان بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش دژی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، ئەنجام دران.

هەواڵەکانی ئەم کردە تیرۆرستییە دەبێتە سەرهەڵدانی گفتوگۆکردن لە بارەی بیرۆکەی تیرۆرستی نێوخۆیی، بەڵام هەندێ شت هەن بەشێک نین لەو گفتوگۆیە. بۆ نموونە گوێبیستی ئەوە نابین شارەزایان باس لەوە بکەن ئایا شەریعەتی مەسیحییەت شوێنکەوتووانی فێری هەڵکوتانە سەر حکومەت و کوشتنی خەڵکی دەکات، یاخود نا. هەرچەندە وێبسایتی هوتاری ئاماژەی بە وتەیەکی پەرتووکی پیرۆز داوە، کە هانی جەنگان و بەختکردنی ڕۆح دەکات لەپێناو ئامانجێکی گەورەتردا. پەرتووکی پیرۆز ئیدانە ناکرێت بۆ هاندانی کردەوەی تیرۆرستی.

هوتاری واتا: «جەنگاوەرە مەسیحییەکان»، هێشتا خەڵکی ئەمریکی ئیدانە و لۆمەی مەسیحییەت ناکەن. ئاسایشی نەتەوەیی ئەو کەسانە جیا ناکەنەوە لە هێڵی ئاسایشی فڕۆکەخانە کە هەڵگری ناوی مەسیحین و جیهان چاوەڕێی هەموو مەسیحییە ئاشتیخوازەکان ناکات، داوای

لێبووردن بکەن بۆ کارێک کە هیچ پەیوەندییەکیان پێوەی نییە، تەنها لەبەر ئەوەی بە ناوی ئەوانەوە ئەنجام دراوە.

بەداخەوە ئەم یاسایانە بەسەر مسوڵماناندا جێبەجێ نابن. کاتێک مسوڵمانێک تاوانێک ئەنجام دەدات، قورئان تاوانبار دەکرێت. بۆ نموونە، دوای ئەوەی بۆمبێکی سەری ساڵ شکستی هێنا، گۆڤارێکی جانوەری واڵ ستریت ئاماژەی بەو ڕاستییە دابوو، عومەر فاروق عەبدولموتەلیب لە پەیمانگای سەنعا بۆ زمانی عەرەبی خوێندویەتی.

موحەمەد ئەلئەنیسی بەڕێوەبەری پەیمانگاکە وتی: «دەیزانی چۆن عەرەبی بخوێنێتەوە و بنووسێت، چونکە دوای مسوڵمانبوونی فێری خوێندنەوەی قورئان ببوو، بەڵام توانای ئاخاوتنی سنووردار بوو.»

هەروەها عومەر فاروق وەک خوێندکارێک هۆنراوەی فەرەنسیشی خوێندبوو، بەڵام دیار بوو ئەمە پەیوەندی بە تاوانەکەیەوە نەبێت. لە لایەکی ترەوە خوێندنی قورئان و زمانی عەرەبی پەیوەست بوو پێوەی.

ئەگەر هەواڵی تیرۆرستێکی مسوڵمان بڵاو بێتەوە، ئیسلام دەستی دەبێت لە تاوانەکەدا. وەلێ ڕێژەیەکی زۆر کەم مەسیحییەت تۆمەتبار دەکەن بە هاندانی کاری تیرۆرستی میلشیای هوتاری. ئەم تیرۆرستە مەسیحییانە بە تاوانباری کوشندە دادەنرێن، چونکە ئاینێکی ئاشتیخوازیان شێواندووە.

لە لایەکی ترەوە تیرۆرستی مسوڵمان شوێنکەوتەی ئاینێکی توندوتیژ و توندڕەوە. تیرۆرستی مەسیحی بە توندوتیژ دادەنرێت بێ گوێدان بە بیروباوەڕی، وەلێ مسوڵمان توندوتیژ و توندڕەوە بەهۆی بیروباوەڕەکەیەوە. ڕەنگە هەندێک بڵێن، بەهۆی ئەوەوەیە، کە قورئان پڕە لە وتەی پڕ توندوتیژی، لە کاتێکدا پەرتووکی پیرۆز تەنها خۆشەویستی و ئاشتی فێری شوێنکەوتووانی دەکات. لە نووسراوێکی ئێن پی ئاردا، فیلیپ جێنکینزی مێژووناس و ئاینناس، ڕوونی کردۆتەوە لە ڕاستیدا

توندوتیژی لە پەرتووکی پیرۆزدا زیاتر بوونی هەیە بە بەراورد بە قورئان. فیلیپ جێنکینز وتی: «زۆر جێی سەرسامییە فەرمایشتەکانی نێو قورئان کەمتر باسی خوێنڕێژی دەکەن و میانڕەوترن لە فەرمایشتەکانی نێو پەرتووکی پیرۆز.» هەروەها ڕوونیشی کردەوە توندوتیژییەکان لە قورئانی پیرۆزدا بە گشتی مەبەست لێیان بەرگریکردنە.

جێنکینز دەڵێت: «بەپێی پێوەرەکانی کات کە سەدەی حەڤدەیەمی دوای زاینییە، یاسای جەنگ کە لە لایەن قورئانەوە دیاری کراوە لۆژیکی و مرۆڤانەیە. پاشان بگەڕێینەوە سەر پەرتووکی پیرۆز دەبینین هەندێک شتی تێدایە بۆ زۆر کەس مایەی سەرسامییە. جۆرێک لە جەنگ لە پەرتووکی پیرۆزدا ئاماژەی پێ دراوە، دەکرێت پێی بوترێت کۆمەڵکوژی.» .

ئایا جۆرێکی تر لە تاوان دروست دەکرێت بە ناوی «تیرۆرستی مەسیحی؟ ئایا هەموو کۆمەڵگەی مەسیحییەت دەست دەکەن بە بەرگری، لە کاتێکدا ڕاگەیاندنەکان دەست دەکەن بە پرسینی «بۆچی مەسیحییەکان ئیدانەی ئەو کردەوە تیرۆرستییە ناکەن؟» ڕەنگە بەو شێوەیە نەبێت. پرسیارەکە ئەوەیە: بۆچی پێویست ناکات کەسێک بە ناوی کریستۆفەر ئیدانەی کردەوەکانی میلشیای هوتاری بکات زیاتر لە کەسێک بە ناوی موحەممەدەوە؟ بۆچی دەبێت چاوەڕوان بکرێت موحەممەد کردەوەکانی بۆمبچاندنی سەری ساڵ ئیدانە بکات، زیاتر لەوەی چاوەڕێ دەکرێت کریستۆفەر ئیدانەی بکات؟

ئاندرو ئارینای ئەفسەری ڕێکخراوی ئێف بی ئای، وتی: «هوتاری تاکە نموونەی گرووپێکی توندڕەوە لە تەواوی کۆمەڵگەکەماندا بوونی هەیە. تاوانەکانیان بە چەشنێک ئەنجام دەدرێن هیچ پەیوەندییەکیان بە پەیڕەوی ئاینەکەیانەوە نییە، نەک ئەوەی ئایینەکەیان هۆکار و پاڵنەر بێت.»

## ئەو وانەیەی لە گوڵەباخێکەوە فێر بووم



گوڵەباخ هەمیشە خۆشەویستترین و پەسەندترین جۆری گوڵ بووە لە لام. هەمیشە سەرسامم بە کاملی و جوانیان بۆ ساتێک. وەلێ لەو ساتە و تەنانەت ساتەکانی دواتریشدا گوڵەباخ وانەیەکی بەهاداری فێر کردووم. مەبەستم وانەی ڕووەکی و کشتوکاڵی نییە، بەڵکوو مەبەستم وانەی ژیانە. چی بەسەر ئەو پەڕەی گوڵەباخانەدا دێت دوای پشکوتنیان؟ چی بەسەر ئەو ڕەنگە سوورە درەوشاوە و قەشەنگەدا دێت کە گوڵەباخەکە دڵگیر دەکات؟ پەڕەی گوڵەکان سیس دەبنەوە. ڕەنگە سوورە درەوشاوەکە دەگۆڕێت بۆ ڕەنگی قاوەیی. ئەو گوڵەباخەی ڕۆژێک لە ڕۆژان پڕ بوو لە جوانی و قەشەنگی و ژیان، وشک هەڵدەگەڕێت و بە نەرمترین دەستلێدان هەڵدەوەرێت و ورد دەبێت. گرنگ نییە چەندە هەوڵ بدەین، چەند جار ئاوەکەی بگۆڕین، یاخود خۆراکی بدەینێ، ناتوانین گوڵەباخێک لە وشکبوون و وەرین بپارێزین.

ئەم پرۆسەیە زۆر پڕ مانا و قووڵە، ئەگەر لێی ڕابمێنین، بێ مەبەست ڕوونادات. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا بە ڕوونی پێمان دەفەرموێت، کە چی وانەیەکی ژیان لە گوڵەباخەوە فێر دەبین. پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ٢٠ ﴾ (الحديد: ٢٠).

واتە: «بزانن ژیانی ئەم دونیایە بریتییە لە یاری و کاتبەسەربردن، دەرِوات و کۆتایی پێ دێت و شانازیکردنە بەسەر یەکتردا بە شتی دونیایی و ماڵ و سامانتانەوە. هاوشێوەی بارانێکی بەسوودە کە دەبارێتە زەوی و جوتیارەکە بە جوانی بەرهەمەکەی سەرسام دەبێت، پاشان سەوز دەبێت و دواتر وشک و زەرد هەڵدێ و لەناو دەچێت. مرۆڤیش وایە، سەرەتا گەنج و لاوە و دواتر پیر دەبێت و دەمرێت. کافران و بێباوەڕان سزای سەختیان بۆ هەیە لەو دونیادا. ژیانی دونیا هیچ نییە، جگە لە فریودەرێک.»

بۆیە وشکبوونەوەی ئەو گوڵەباخە نیشانە و ئاماژەیەکە بۆمان. یەکێک لە گرنگترین و تاڵترین ڕاستییەکانی ژیانمان فێر دەکات، کە هیچ شتێک لەم ژیانەدا هەمیشەیی نییە. هەموو شتێک کۆتایی دێت و لەناو دەچێت، جگە لە پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات. ئەستێرە جوانەکانی فیلمەکان دەبینین لەسەر شاشەی تەلەفیزۆنەکانمان. بە لایاندا تێدەپەڕین، کاتێک لەسەر بەرگی گۆڤارەکاندان. سەرسامی ڕووخسارە دڵگیر و لاشە ڕێک و جوانەکانیانین، بەڵام چی بەسەر ئەو ڕووخسارانەدا دێن، دوای دە، بیست، یاخود سی ساڵێکی تر؟ ڕووخساریان چرچولۆچ دەبێت، کاڵ دەبنەوە و دەمرن. چی بەسەر بلیمەتترین و زیرەکترین مێشکدا دێت؟ پەنجا ساڵ دوای ئەوەی داهێنانێک، یاخود دۆزینەوەیەکی سەرسامکەری ڕاگەیاند؟ ڕەنگە بە بێدەنگی لە سووچێکی خانەی بەساڵاچواندا ڕاکشابێت و هەوڵ بدات ناوی خۆی بیر بێتەوە.

ئایا تێڕامان لەم ڕاستیانەی ژیان بۆ ئەوەیە خەمبار و دڵتەنگمان بکات و ناچارمان بکات بە تەممەڵی؟ نەخێر، ئەم ڕاستیانە نیشانە و بەڵگەن و ڕێنوێنین بۆمان. لە ڕێی سیسبوون و وشکبوونی گوڵەباخ و وەرینی پەڕەی گوڵەباخەوە، پەروەردگار بیرمان دەهێنێتەوە هەموو شتێکی ئەم دونیایە کۆتایی دێت. بیرمان دەخاتەوە هیچ شتێک لەم دونیایەدا هەمیشەیی نییە، جگە لە زاتی مەزنی. ئەم ڕاستیانە بۆ خەمبارکردنی ئێمە نین، بەڵکوو بۆ ئەوەن بەئاگامان بێننەوە و بیرمان بخەنەوە کە نابێت هەرگیز وابەستەی ئەم شتە فریودەرانە بین. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئەم ڕاستییەمان چەندین جار بیر دەهێنێتەوە و دەفەرموێت:

﴿ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾ (القصص: ٨٨)، واتە: «لە شتێکی تر مەپاڕێرەوە، جگە لە پەروەردگار، هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە، جگە لە زاتی مەزنی، جگە لەو هەموو شتێک لەنێو دەچێت. بڕیاردان هەر بۆ زاتی پەروەردگارە و هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە.»

لە سورەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ ﴾(الرحمن: ٢٦-٢٧).

واتە: «هەموو شتێک لەناو دەچێت، جگە لە زاتی مەزنی پەروەردگار.»

ئەمانە دەربڕینی زۆر پڕ مانان، کە مەبەست لێیان هەژاندن و بەئاگاهێنانەوەمانن لە ناخەوە. سورەتێک لە قورئانی پیرۆزدا هەیە کە لە سێ ئایەتی کورت پێکهاتووە و ئەم ڕاستییە زۆر بە جوانی ڕوون دەکاتەوە. ئەویش سورەتی، (العصر)ە. ﴿ وَٱلْعَصْرِ ﴿١﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ﴿٣﴾ ﴾ (العصر: ١-٣). پەروەردگاری مەزن لە سەرەتای

سورەتەکەدا سوێند بە کاتی عەسر دەخوات. پاشان وشەی (إن) (بەڕاستی) و (إلا) (لە ڕاستیدا) کە هەردووکیان بۆ جەختکردنەوەن بەکار دێنێت. بەکارهێنانی سوێندخواردنێک و دوو وشەی جەختکردنەوە ئاماژەن بۆ وتە و دەربڕینێکی زۆر توند، کە ئەمەیان بە دوادا دێت «لە ڕاستیدا مرۆڤەکان دەدۆڕێن.»

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: ئایا مرۆڤ چی دەدۆڕێت و لە دەست دەدات؟ هەموو شتێک. لەدەستدانی کات، لەدەستدانی ئەو کەس و شتانەی خۆشمان دەوێن، لەدەستدانی تەندروستی، جوانی، هەوڵدانی بێبەرهەم. کاتێک ئەم شتانە لەدەست دەچن، ئەوە بە تەواوی دۆڕاوین، جگە لە دەستەیەک لە خەڵکی هەڵبژێردراو: «ئەوانەی باوەڕدارن و کاری چاکە ئەنجام دەدەن و ئامۆژگاری یەکتری دەکەن بۆ سەر ڕێی ڕاست و بەردەوامبوون.»

بۆ ئەو دەستە هەڵبژێردراوە هیچ لەدەستدان و دۆڕانێک نییە. کەواتە تەنها بەهۆی باوەڕ و کردەوەکانمانەوەیە دەتوانین شتانێک بەدەست بهێنین لەم ژیانە لەناوچووەدا. تەنها بە ڕزگاربوون لە وابەستەبوونە هەڵە و فریودەرەکانمان و پەیوەستبوون بە پەروەردگارەوە دەتوانین لە زەریای تراویلکەدا بە ئاوەوە بگەڕێینەوە. تەنها پەروەردگار نەمرە و بۆ هەمیشە زیندووە. بۆیە تەنها ئەو شتانەی لەپێناو پەروەردگاردا ئەنجام دەدرێن، دەمێننەوە. تەنها ئەو شتانەی لەپێناو پەروەردگاردا خۆش دەویسترێن لە کۆتاییدا دەگەڕێنەوە لامان. جگە لەمانە هەموو شتێکی دی لەناو دەچێت و دەفەوتێت. هەموو شتێکی دی هاوشێوەی ئەو پەڕە گوڵە وەریوانە دەبن، کە ئیمڕۆ خۆشمان دەوێن، وەلی سبەی وشک دەبنەوە و هەڵدەوەرێن.

# هەوڵدان و ڕووناکیی کۆتایی تونێلەکە



ئەو شتانەی دایکایەتی فێرت دەکات زۆر سەرنجڕاکێشن. سێ هەفتە لەمەوبەر تووشی گەورەترین تاقیکردنەوە بووم، کە ئافرەت تووشی دەبێت. ئەزموونێک بوو کە بە تەواوی ژیانم دەگۆڕێت. سێ هەفتە لەمەوبەر بوومە دایک.

ئازاری منداڵبوون بە دڵنیاییەوە هۆکارێکی هەیە کە وشەی (labor)ی بۆ هەڵبژێردراوە، کە بە مانای (زۆر هەوڵدان و کارکردن)یش دێت. لەو ململانێیەدا و تەنانەت لەوەش گرانتر پەروەردەکردنی منداڵە، کە بە دوایدا دێت و لێیەوە فێری وانەیەکی بەهاداری ژیان دەبین.

دەوترێت: «باشترین شتەکانی ئەم ژیانە بێبەرامبەرن.» بەڵام لەنێو ئەو هەموو درۆیانەی پێمان دەوترێت ئەم وتەیە گەورەترین درۆیە. هیچ شتێک لەم ژیانەدا بێبەرامبەر نییە، بە تایبەت باشترین شتەکان. هەموو شتێک نرخی خۆی هەیە. تاکو شتەکە بەهادارتر و گرنگتر بێت، نرخەکەی بەرزتر و زیاترە.

هەموو شتێکی گرنگ و شایستە، پێویستی بە کارکردن و هەوڵدانە بۆی. پەروەردگاری مەزن لە قورئانی پیرۆزدا ئەم ڕاستییەمان فێر دەکات، کاتێک دەفەرموێت: ﴿ وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعۡيَهُۥ

سَوۡفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجۡزَىٰهُ ٱلۡجَزَآءَ ٱلۡأَوۡفَىٰ ﴿٤١﴾ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلۡمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ ﴾(النجم: ٣٩-٤٢)، واتە: «هەوڵ و توانای مرۆڤ خۆی نەبێت، هیچ شتێک سوودی پێ ناگەیەنێت (٣٩) و هەوڵ و تێکۆشانی خۆیشی لە ڕۆژی قیامەتدا دەبینێتەوە (٤٠). پاشان پەروەردگار بە تەواوی پاداشتی دەداتەوە (٤١). گەڕانەوەیش هەر بۆ لای پەروەردگاری مەزنە (٤٢).»

بۆیە پەروەردگار پێمان دەفەرموێت پێویستە لەم ژیانەدا هەموو کات هەوڵ بدەین و تێبکۆشین. هەروەها پێمان دەفەرموێت هەموو هەوڵێکمان بەرهەمی خۆی دەبێت، بۆ نموونە منداڵبوون. ئایا پەروەردگار نەیدەتوانی منداڵبوون بە تەواوی بێ ئێش و ئازار و ئاسان بکات؟ نەدەکرا هەموومان بێ ئەوەی دایکمان تووشی خوێنبەربوون و ئازار بکەین، بێینە ئەم دونیایەوە؟

یاخود بیر لە دووگیانی بکەرەوە. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ وَهۡنًا عَلَىٰ وَهۡنٖ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيۡنِ أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيۡكَ إِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾ (لقمان: ١٤)، واتە: «ئامۆژگاری مرۆڤمان کردووە بەوەی چاکەکار بن لەگەڵ دایک و باوکیاندا. ئەو دایکەی منداڵ لە سکیدا هەڵدەگرێت و بە هۆیەوە لاواز و بێهێز دەبێت، پاشان دوو ساڵ شیری پێ دەدات و دواتر لە شیر دەیبڕێتەوە. سوپاسگوزاری من بە، پاشان دایک و باوکت. سەرئەنجامیش بۆ لای من دەگەڕێنەوە.»

ئایا پەروەردگار نەیدەتوانی لە ماوەی شەوێکدا منداڵ دروست بکات، بێ ئەوەی دایکان نۆ مانگ لە سکیاندا هەڵیبگرن؟ ئایا نەدەکرا گەشە بکەین بێ ئەوەی ببینە هۆی نەخۆشبوون و ماندووبوون و سەختی ڕێکردن، خەوتن، هەناسەدان و خواردنی دایکمان؟

بەڵام بەهۆی ئەو هەوڵدان و تێکۆشانەوە چیمان دەست دەکەوێت؟ بەهۆی هەوڵ و ماندووبیمانەوە یەکێک لە گەورەترین و بەهادارترین

خەڵاتەکانی پەروەردگار وەدەست دێنین: منداڵێکی جوان و دڵگیر، بەڵام ئەوە بێبەرامبەر نەبوو. هیچ شتێکی ئەم ژیانەش بێبەرامبەر نییە. ئەگەر دەتەوێت مەدالیای ئاڵتوونی ببەیتەوە، پێویستە ڕاهێنان بکەیت. ئەگەر دەتەوێت بڕوانامەیەک بەدەست بهێنیت، پێویستە چەندین ساڵ شەونخونی و ڕۆژانی ماندوویی بەسەر بەریت و بۆی بخوێنیت. تەنانەت سادەترین شت کە بتەوێت لەشێکی ڕێک و جوانت هەبێت، پێویستە ڕاهێنانی بۆ بکەیت.

ئەگەر دەتەوێت بەهەشت بەدەست بهێنیت، پێویستە هەوڵی بۆ بدەیت. ئەگەر دەتەوێت لە کۆتاییدا لەگەڵ پەروەردگاردا بیت، پێویستە بەرگەی ئازاری برسێتی مانگی ڕەمەزان بگریت، واز لە خەو بهێنیت بۆ ئەنجامدانی نوێژی بەیانیان، سەروەت و سامانەکەت ببەخشیت و زەکات دەربکەیت. ئەمە نرخی بەهەشتە، کە خەڵاتێکە لە لایەن پەروەردگارەوە و بێگومان بێبەرامبەر نییە.

بە هەمان شێوە کوڕەکەم خەڵاتێک بوو، دەبوو لەپێناو بەدەستهێنانیدا تێبکۆشم و ماندووبم. ئەو هەوڵدانە تایبەتمەندییەکی ئەم دونیا ناکامڵەیە، کە هەرگیز ئاسان و سادە نییە. کاتێک تەماشای منداڵێک دەکەیت لە سەرەتای هاتنە دونیایەوە ئەم ڕاستییەت بۆ ڕوون دەبێتەوە. یەکەمین شتێک ئەنجامی دەدەین، کاتێک دێینە ئەم دونیایەوە دەگرین و هەوڵ دەدەین هەناسە بدەین. ڕاستییەکانی ژیانمان بۆ دەردەکەوێت کە تێیدا خوێنمان دەڕژێت، هەست بە برسێتی، ترس و ئازار دەکەین. ڕاستەوخۆ هەموو ڕاستییەکانی ژیانمان پێکەوە پێ دەناسێنرێت.

ئەم ڕاستییە لە قورئانی پیرۆزیشدا ئاماژەی پێ دراوە کاتێک پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ ﴿٤﴾ ﴾. (البلد: ٤). واتە: «مرۆڤمان بە ڕێکی و دامەزراوەیی دروست کردووە، یاخود

دروستمان کردووە بە چەشنێک کە لە دونیادا تووشی چەندین ناڕەحەتی و سەختی دێت.»

بەڵام هاوشێوەی کوڕەکەم کە چەشنی ڕووناکییەکی درەوشاوەی کۆتایی تونێلێک وابوو، پەروەردگار بەڵێنی خەڵاتی بێهاوتامان پێ دەدات، وەکو بەرهەمی هەوڵەکانمان لەم ژیانەدا. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَٰقِيهِ ۝٦ ﴾ (الإنشقاق: ٦)، واتە: «ئەی مرۆڤ، ئێوە لە دونیادا هەوڵ و تێکۆشان دەکەن بەرەو پەروەردگار و هەر پێی دەگەن.»

## گرنگی نییەت لە کار و کردەوەدا



بۆ ئەو خوشکانەی هەست دەکەن لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا بەهۆی سووڕی مانگانەوە لە پەرستش دابڕاون، ئەمەتان لە یاد بێت: هێشتا دەتوانیت بەشدار بیت لە دوو جۆر پەرستشی گرنگدا. پەیامبەری نازدار(ﷺ) فەرموویەتی: «نزاکردن و پاڕانەوە پەرستشە.» هانابردن بۆ پەروەردگاری مەزن کرۆکی پەرستشە و پەیوەندییەکی بەهێز لەگەڵ خالقماندا دروست دەکات.

گرنگ نییە شوێنکەوتەی کام فیقهـ و مەزهەب بیت، دەتوانیت قورئان بخوێنیتەوە و گوێی لێ بگریت. تەنانەت توندترین بۆچوونەکان ڕێت دەدات گوێ لە قورئان بگریت و تەفسیرەکەی بخوێنیتەوە. لە کۆتاییدا لە یادت بێت، نوێژنەکردنت لە ماوەی سووڕی مانگانەدا خۆی لە خۆیدا پەرستشە، چونکە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری پەروەردگار دەکەیت. کردەوە بەپێی نییەتە. پەروەردگار دەزانێت و زانایە بەوەی لە دڵەکاندایە و ئەو شتەی نیەتت بووە و ویستووتە ئەنجامی بدەیت، پەروەردگار پاداشتی خێرت دەداتەوە، ئەگەر نیەتت باش و گوێڕایەڵی ئەو بووبێت.

# چاوەکان



سەرنجم داوە خوویەکی مەترسیدار تەواوی کۆمەڵگەکەمانی تەنیوە. چەندین ئایەت و فەرموودە هەن، پشتڕاستی ئەوە دەکەنەوە دڵ گەورە و پادشای جەستەیە. دڵێکی پاک (قلب سليم) ڕێنمویی مرۆڤ دەکات ژیانێکی ئیماندارانە بەڕێ بکات و سەربەرزی ژیانی هەردوو دونیای دەکات. دڵی نەخۆش بە پێچەوانەوەیە. مرۆڤ بەرەو ژیانێکی خراپ و شێواو ئاڕاستە دەکات و ڕوورەشی دونیا و قیامەتی دەکات. پەروەردگار خۆی بمانپارێزێت. وەلێ لە ئێستادا شتێکی گرنگ بە تەواوی لە یاد کراوە. بیرت بێت دڵ ڕێچکە و دەروازەی هەیە. تەواو باوەڕم وایە زۆربەی زۆری نەهامەتی و ئازارەکانی ئەمڕۆمان وەکو تاک، هاوسەر، خێزان و ئوممەتی مسوڵمانان، بەهۆی فەرامۆشکردنی یەکێک لە دەروازە گرنگەکانی دڵەوەیە، کە چاوەکانە. لە جیهانێکدا دەژین لە ڕێی چاوەکانەوە بەردەوام تووشی وروژان دەبین، جا بە شێوەی ڕاستەوخۆ بێت، یاخود شاشەی تەلەفزیۆن و مۆبایلەکانەوە بێت.

بە تەواوی چەمکی پاراستنی چاوەکانمان لەدەست داوە. بە تەواوی ئەوەمان لەدەست داوە و لە یادمان کردووە ئاگاداری ئەو شتانە بین، کە دەچنە ئارامگەی پیرۆزی ناخمانەوە. تەواو دەرچەی ناخمان بۆ هەموو شتەکان ئاوەڵا کردووە.

بهێنە خیاڵت چی ڕوودەدات ئەگەر بە شەو و ڕۆژ دەرگای ماڵەکانمان بە کراوەیی جێبهێڵین. دەزانیت چی و کێ دێتە ماڵەکانمان؟ ئاژەڵ، دز، پیاوکوژ و چەتە. دەتوانیت بهێنیتە پێش چاوت، چی ڕوودەدات ئەگەر دەروازەی ناخت ئاوەڵا بکەیت؟ لە ئێستادا دڵەکانمان لەم دۆخەدان. هیچ پالاوتنێک و پاسەوانێکی نییە. سیاسەتی کرانەوەی تەواوەتیمان بۆ پیرۆزترین پەناگەمان پەیڕەو کردووە، کە ئەو پەناگەیەش دڵە.

بۆچی هۆگربوون بە وێنە و ڤیدیۆ ڕووتەکان، بۆتە دیاردەیەکی باو لە کۆمەڵگەکەماندا؟ بۆچی دەهێڵین ژیان و هاوسەرگیری و خێزانەکانمان لەنێو بەرێت؟ بۆچی گومڕایی زیادی کردووە؟ بۆچی خزاوینەتە نێو هەوا و ئارەزووی سێکسییەوە؟ بۆچی هاوسەرگیری و ژیان و تەمەنمان بەرەکەت و خۆشی نەماوە؟ بۆچی هێندە لە خۆمان و ژیانمان و بەخششەکانمان ناڕازین؟ چونکە دڵەکانمان ژەهراوی کردووە. ئەویش لە ڕێی چاوەکانەوە.

تەنانەت ئەوانەیشی کە تەواو لە وێنە و ڤیدیۆ ڕووتەکاندا ڕۆنەچوون چەمکی نزمکردنەوە و داخستنی چاوەکان لە ئاست کەسانی نامەحرەمدا بە تەواوی لەنێوماندا نەماوە.

لە دونیای ئینیستاگرامدا دەژین، کە بەردەوام تێیدا تەماشای وێنەی ڕەگەزی بەرامبەر دەکەین. ئەم دیاردەیە بە تەواوی ئاسایی بۆتەوە، بە چەشنێک کەسانی هاوسەرداریش لە هەمان دۆخدان، بەڵام ئەمە ژەهرە. بە کورتی و پوختی بە دەستی خۆمان دڵەکانمان و پەیوەندییەکانمان ژەهراوی دەکەین. دڵەکانمان لەنێو دەبەین. لە یادت بێت پەروەردگار دروستکراوەکانی خۆی زۆر باش دەناسێت. هۆکارێک هەیە کە پەروەردگار فەرمان بە پیاوان و ئافرەتان دەکات ئاگاداری چاوەکانیان بن:

﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ

بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ (النور: ٣٠-٣١). واتە: «بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن هەروەها نامووس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکتر و پوختترە بۆیان، بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو هەڵس و کەوت و ڕەفتارانەی کە دەیکەن(٣٠) بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن، داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناه و جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا و جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بە تەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت، یان باوکی خۆیان، یان باوکی مێردەکانیان، یان کوڕی خۆیان، یان کوڕی مێردەکانیان، یان بۆ براکانی خۆیان، یان برازاکانیان، یان خوشکەزاکانیان، یان ئافرەتێک کە پەیوەندییان هەیە پێکەوە، یان ئەوانەش کە کەنیزەکانیان یان ئەوانەی کە لەماڵەکانتاندا دەژین و پێویستیان بە ئافرەت نییە یاخود ئەو منداڵانەی کە هێشتا شارەزاییان لە ئافرەتان نییە و نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بە زەویدا و بزانرێت کە زینەتدار و خشڵدارن، کەواتە هەمووتان ئەی ئیمانداران بەرەو لای خودا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ڕزگار و سەرفرازبن.».

هۆکارێک هەیە کە پەروەردگار ئاگاداری کردووینەتەوە، نەک تەنها بەوەی لە زینا و داوێنپیسی دوور بکەوینەوە، بەڵکوو نابێت نزیکیشی بکەوینەوە. ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾ (الإسراء: ٣٢).

واتە: «هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیک ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناهـ و تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵایە.».

کاتێک کچەم مناڵ بوو، تووشی نەخۆشی بوو و پێویستی بە دەرمانی دژەبەکتریا بوو، بەڵام ڕەتی کردەوە دەرمانەکانی بەکار بهێنێت. ناچار بووم زۆری لێ بکەم و بە زۆر دەرمانەکانی پێ بدەم، وەلێ ڕێگایەکی دەدۆزییەوە تاکو لە قوڕگی دەری بهێنێتەوە. پاشان تووشی تا هات. زۆر ئازاری هەبوو، وەلێ بە هەموو شێوەیەک ڕەتی دەکردەوە ئەو دەرمانە بەکار بهێنێت کە چارەسەری ئازارەکەی دەکرد. تەنها کچەکەم نییە کە بەم شێوەیە بێت. لەم دواییەدا لە بارەی بابەتێکی هەستیارەوە نووسیم، کە زۆر گرنگە لام. باسم لە ئەو ئافرەتانە کرد، کە ڕەتی دەکەنەوە پەیوەندییە شێواو و خراپەکانیان جێبهێڵن، بەڵام باسم لەو هۆکارانە نەکرد کە بۆچی ئەمە ڕوودەدات، چونکە بابەتێکی زۆر قووڵ و وردە.

ساڵی ڕابردوو دەبوو کارێک ئەنجام بدەم کە بە لامەوە سەخت و ناڕەحەت بوو. چاوم بە ئافرەتێک کەوت پێی وتم، مێردەکەی ساڵێک، یاخود دوو ساڵ دەبێت ئافرەتێکی لەشفرۆشی بە کرێ گرتووە. پێی وتم مێردەکەی لە کۆتایدا پەیوەندی لەگەڵ ئەو ئافرەتە لەشفرۆشەدا بەستووە و ماوەی ساڵێک دەبێت پەیوەندییەکی بەردەوامیان پێکەوە هەیە. ئەم ئافرەتە نەک ئەوەی هێشتا لە مێردەکەی جیا نەبووبوویەوە، بەڵکوو لەژێر هەمان سەقفدا و لە یەک خانوودا پێکەوە دەژیان.

ئەم ئافرەتە تەواو ماندوو و شەکەت ببوو و لە ئازارێکی زۆردا بوو، وەلێ ڕەتی دەکردەوە دەرمانەکە بەکار بهێنێت. دەرمانەکە خرابوویە نێو قوڕگیەوە، بەڵام دەریکردەوە و تفانیەوە. بۆچی ئەم کارەی کرد؟ بە زەقی تەماشایەکی نێوچاوانیم کرد، تاکو دڵنیابم لەوەی بە تەواوی گوێبیستمە. بە توندی پێموت: «ئەو پیاوە پەروەردگار و خاوەنی تۆ

نییە.» دەزانم ئەم قسەیەم تەواو کاری تی کرد، چونکە ڕاستەوخۆ دەستی کرد بە گریان.

زۆر شتم نووسیوە و وتووە لەبارەی وابەستەبوون و هۆگربوونی ناتەندروست و هەڵەوە، بەڵام زۆرێکمان لە هۆگربوونی ناتەندروست تێناگەین. ئەزموونی ئەم ئافرەتە، نموونەیەکی کرداری هۆگربوونی ناتەندروستە، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەم هۆگربوونە ناتەندروستە ڕووپۆش کراوە بە چەند بەهانەیەکی وەکو، «خۆشەویستی» «لەپێناوی منداڵەکان»، «دڵسۆزی و بەوەفابوون»، «سەبر و ئارامگرتن» و «قوربانیدان». بە کورتی و پووختی ئەم هۆگربوونە جۆرێکە لە پەرستن.

بەم شێوەیە دەبێت کاتێک شتێک (مێردەکەت) دێنیت و دەیخەیتە بەشێکی دڵتەوە، کە تەنها و تەنها شوێنی پەروەردگارتە. لە ئەنجامدا دەبیتە کۆیلە و بەندە.

تکایە سەرنج لە وتەکانم بدە: هیچ کات ناتوانیت بەو شکۆ و ڕێزەوە ڕەفتار بکەیت کە شایستەتە، تاکو ئەو کاتەی مرۆڤێک بپەرستیت لەبری پەروەردگارت. هەموو کات بێڕێزیت پی دەکرێت و نزم دەبیتەوە، چونکە ئەوە دەرئەنجامی جۆرێکە لە جۆرەکانی هاوبەشیدانان بۆ پەروەردگار. هاوبەشیدانان نزم و لاوازمان دەکات و لە ناخەوە لەناومان دەبات. بۆ ئەو ئافرەتەم ڕوون کردەوە بەهۆی هۆگربوونی ناتەندروستی مێردەکەیەوە، وەکو ئەوەیە زنجیرێکی خستبێتە ملی خۆیەوە و پاشان زنجیرەکەی بە ئۆتۆمبێلی مێردەکەیەوە توند کردبێت. مێردەکەی بۆ هەرکوێ بڕوات، ئەو بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێت. تەنها ڕێگە بۆ دەربازکردنی خۆی بریتییە لە شکاندن و پچڕاندنی ئەو زنجیرە. تەنها ڕێگە بۆ چاکبوونەوە، بریتییە لە قوتدانی ئەو دەرمانەی خراوەتە نێو قورگیەوە.

# ڕەگەزپەرستی



ئایدۆلۆژیای ڕەگەزپەرستی سەرەتا لە لایەن شەیتانەوە سەری هەڵدا. قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾﴾ (الأعراف: ١٢)، واتە: «پەروەردگار بە شەیتانی فەرموو: چی ڕێگری لێ کردیت سوجدە بۆ ئادەم ببەیت؟ شەیتان وتی: من باشتر و لەپێشترم لەو، منت لە ئاگر دروست کردووە و ئەویشت لە خۆڵ دروست کردووە.»

بنچینەی یاخیبوونەکەی شەیتان بریتی بوو لە لووتبەرزی و پلە و پایە. هەڵسەنگاندنی مرۆڤێکی تر بوو بە پشتبەستن بە پێوەرێک کە هیچ پەیوەندی بە باشیی ڕەفتار و کەسایەتییەوە نەبوو.

کاتێک تەواوی سیستەمێک لەسەر ئەم بنچینەیە پێکدێت، لەناوچوونێکی کوشندە ڕووی تێدەکات. بۆ تێگەیشتن لە پاڵنەری تاکەکەسی، یاخود کۆمەڵگەیەک، پێویستە تەماشای بنچینەکەی بکەین. ئەوان چی شتێک پیرۆز و بەرز ڕادەگرن؟ چی شتێک دەپەرستن؟

کۆمەڵگەیەک لەسەر پارە و هێزپەرستی بنیات نرابێت، کۆمەڵگەیەکی تەواو نادادپەروەر دەبێت. ئەم نادادپەروەرییەیش زۆر شێوە و ڕەنگ لەخۆ دەگرێت. ڕەگەزپەرستی دامەزراوەیی

یەکێکە لە ناشیرینترین و بێزراوترین جۆرەکانی. سیستەمێک لەسەر چەوساندنەوەی هەژاران بنیات نرابێت بۆ ئەوەی دەوڵەمەندەکان دەوڵەمەندتر بکات، لە کۆتاییدا لە ناوەوە دادەخورێت و لەناو دەچێت.

قورئانی پیرۆز ئاماژە بەم ڕاستییە دەکات و دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ١٦ ﴾. (الإسراء: ١٦)، واتە: «ئەگەر بمانەوێت شارێک، یاخود دێیەک لەناو ببەین، دەیانکەین بە دەسەڵاتدار و ئەوانیش خراپە دەکەن، پاشان ئێمەیش لەناویان دەبەین.»

## لەپێناو زێڕدا ئەڵماسەکەت لەدەست مەدە



پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئامۆژگاری ئیمانداران دەکات و دەفەرموێت: «اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ» (الحشر: ١٨). واتە: «لە پەروەردگار بترسن و بزانن چیتان ئامادە کردووە بۆ سبەینێ، کە ڕۆژی قیامەتە.»

پەروەردگار ئاگادارمان دەکاتەوە لەوەی هۆشیار بین لەبارەی ئەوەی چی ئامادە بکەین بۆ داهاتوومان. لەم دواییەدا هاوسەرەکەم باسی پیاوێکی بۆ کردم کە دەیناسی و تازە هاتبوو بۆ بەریتانیا. ئەم پیاوە تەواوی ژیانی خۆی لە گەڕان بەدوای خوێندن و پیشەکەیدا بەسەر برد. لە کاتێکدا تەرکیزی خستبوویە سەر شتانێک و منداڵەکانی فەرامۆش کردبوو، هەستی بە گرفتێکی گەورە کرد و وتی هاتووە بۆ بەریتانیا و تەرکیزی لەسەر بەدەستهێنان و کۆکردنەوەی پارە بووە، وەلی منداڵەکانی لەدەست داوە. بۆیە وتەیەکی زۆر بەپێزی لە زار هاتە دەر: «هاتم بۆ ئێرە تاکو زێڕ بەدەست بهێنم، وەلی ئەڵماسەکانم لەدەست دا.» ئەوەی وای کردووە ئەم وتەیە زۆر پڕمانا و بەپێز بێت، ئەوەیە لەم سەردەمەدا ئەم حاڵەتە بەسەر زۆرێکماندا هاتووە. لەم ژیانەدا شوێنی زۆر شت دەکەوین کە هەندێکیان شتانێکی حەڵاڵن، (پیشەیەکی باش، سەروەت و سامان، پۆست و

پلە)، ئێمە ئەم شتانەمان دەوێت بۆ خۆمان و منداڵەکانمان. دەبێت ئاگادار بین، چونکە هەندێک جار لەم کێبڕکێ و هەڵپەکردنەماندا شتانێکی زۆر بەنرختر و بەهادارتر لەدەست دەدەین. دڵ و ڕۆحی منداڵەکانمان لەدەست دەدەین. ئەوەش یەکێکە لە ترسناکترین و خراپترین شتەکان، چونکە لە کۆتاییدا هەمووان دەچنە نێو گۆڕی خۆیانەوە. گرنگ نییە بیروباوەڕت چی بێت (مەسیحی، جوولەکە، مسوڵمان، یاخود بێباوەڕ). ناتوانیت نکۆڵی لەم ڕاستییە بکەیت. کاتێک دەچینە نێو گۆڕەوە، هەموو ئەو شتانەی شوێنی کەوتووین (سەروەت و سامان، پۆست و پلە، پیشە و بڕوانامە)، بەجێمان دێڵن و لەگەڵماندا نایەنە گۆڕەکەوە. لە ڕاستیدا ئەو پیاوەی باسم کرد، چەندین بڕوانامەی هەبوو و بڕوانامەی دکتۆرایشی بەدەست هێنابوو، هەر بۆیە وتی: «شوێنی بەدەستهێنانی زێڕ کەوتم، وەلێ ئەڵماسە بەهادارەکانی خۆمم لەدەست دا.»

تەنها سێ شت هەن لەگەڵتدا دێنە نێو گۆڕەوە و هاوەڵیت دەکەن. یەکێک لەو سێ شتە بریتییە لە منداڵی ساڵح و چاکەکار، کە نزات بۆ دەکەن. ڕاستە لە دونیادا جێی دێڵیت، بەڵام هەر چاکەیەک ئەنجامی دەدات و نزایەک بۆتی دەکات، دەبێتە هاودەمت، تەنانەت دوای مردنیشت. دووەمیان بریتییە لە چاکەیەکی هەمیشەیی (صدقة جارية)، پرۆژە و کار و چاکەیەک بە بەردەوامی سوود بە کەسانی تر دەبەخشێت، تەنانەت دوای مردنیشت. دەچێتە نێو گۆڕەکەتەوە، وەلێ بەردەوام چاکە و خێر بۆ تای تەرازووی چاکەت زیاد دەبێت بەهۆی ئەو پرۆژە و کارە خێرخوازییەی لەدوای خۆت بەجێت هێشتووە و سوود بە خەڵکی دەگەیەنێت. سێیەمیان بریتییە لە زانست و زانیارییەکی سوودبەخش کە بەخشیوتە بە کەسانی دی، کەسانی دیت فێر کردووە و بەردەوام سوود بە کەسانی دی دەگەیەنێت،

تەنانـەت دوای چوونـە گۆڕەکەتـەوە. بـۆ سـاتێک بیـر بکـەرەوە لـە وەبەرهێنانێـک، ئـەم سـێ شـتە لەخـۆ بگرێـت، بریتییـە لـە وەبەرهێنـان لـە خوێندنگەیەکی ئیسلامیدا. وەبەرهێنان لـە پەروەردەکردنی منداڵدا. ئەگـەر بـە شـێوەیەکی پیشـەیی لێـی بڕوانیـت، دەتەوێـت قازانجەکـەت زیـاد بکەیـت. بیـر لـە هـەوڵ و ماندووبوونەکـەت بکـەرەوە و بزانـە چـۆن دەتوانیـت دەسکەوت و قازانجەکـەی زیـاد بکەیت. ئـەم کارە لـە ڕێگای کردنـەوە و خزمەتکـردن لـە ڕێگای خوێندنگایەکـی ئیسـلامی و پەروەردەکردنـی منداڵـدا دەبێـت بـە شـێوەیەکی بـاش و دروسـت. پاشـان پـەروەردگار بـەردەوام دەبێـت و دەفەرموێـت: ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ﴾ (الحشـر: ١٩).

واتـە: «لـەو کەسـانە مەبـن پەروەردگاریـان لـە یـاد کـرد و پاشـان پـەروەردگار وای لـێ کـردن خۆیشـیان لـە یـاد بکـەن.»

فەرمایشـتێکی پڕ مانـا و قووڵـە. کاتێـک پـەروەردگار چیدی بەشـێک نابێـت لـە ژیانمـان لـە یـادی دەکەیـن، نـەک ئـەوەی پـەروەردگار لـە یـاد دەکەیـن، بەڵکـوو لـە ئەنجامـدا خۆیشـمان لـە یـاد دەکەیـن. ئامانـج و مەبەسـتی ئێمـە لـەم ژیانـەدا چییـە؟ پـەروەردگار دەفەرموێـت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ (الذاریات: ٥٦)، واتـە: «جـن و مرۆڤـم دروسـت نەکـردووە، ئیلا بـۆ پەرسـتش نەبێت.». بۆیە باس لەوە دەکەم، چونکـە وشـەی (عبودیة)، تەنهـا نوێـژ و نـزا ناگرێتـەوە، بەڵکـوو هەمـوو ئـەو کـردەوە و چاکانـە دەگرێتـەوە، لەپێنـاو ڕەزامەنـدی پـەروەردگاردا ئەنجامیـان دەدەیـن، وەکـو خزمەتکـردن لەپێنـاو پـەروەردگاردا، دانانـی پـەروەردگار بـە بنچینـەی ژیانمـان، بوونـە هاوسـەرێکی بـاش. کاتێـک لـەو ڕێگەیـە لادەدەیـن و پـەروەردگار لـە یـاد دەکەیـن، تووشـی ونبـوون دێیـن. ئێمـەی دایـکان و بـاوکان بەرپرسـین لـە منداڵەکانمـان، هـەروەک پـەروەردگار دەفەرموێـت لـە ڕۆژی دوایـدا هەمـووان پرسـیاریان لـێ

دەکرێت لـە بـارەی ئەمانەتەکانیانـەوە. پـەروەردگار چەندین شـتی بـە ئەمانـەت پـێ بەخشـیوین، یەکێک لـەو شـتانە بریتییـە لـە منداڵەکانمـان. پەروەردگار لێمـان دەپرسـێت چیمـان کردووە لـە منداڵەکانمـان و چـۆن مافەکانیانمـان پـێ داوە لـە ڕووی پەروەردەکردنێکـی ئیسـلامیانەوە. ئـەوە شـتێکی ئارەزوومەندانـە نییـە، بەڵکوو شـتێکی ئیجبارییـە. ئەگـەر بەهـۆی فریوخواردنـی دونیاییـەوە لـەم کارەدا کەمتەرخەمیمـان کـرد، پـەروەردگار لێمـان دەپرسـێتەوە بۆچـی بـە شـێوەیەکی دروسـت و بـاش منداڵەکانمـان پـەروەردە نەکردووە؟ لـە کاتێکدا مافـی خۆیانـە و لەسـەر ئێمـە پێویسـتە بۆیـان دابیـن بکەیـن.

## ڕێگای نهێنی بەرەو بەختەوەری



هەمیشە پێمان وتراوە یارمەتی کەسانی دی بدەن، چونکە پێویستیان پێمانە، وەلێ من دەمەوێت بڵێم یارمەتی کەسانی دی بدەن، چونکە پێویستتان پێیانە. دەزانم سەیر و نامۆ دیارە، بۆ نموونە کەسانێک هەن لە سوریا پێویستیان بە خواردن و خواردنەوە و پاراستنە، چونکە لەژێر هێرش و گرفتدان، ئێمەش لێرە سەلامەت و تەندروستین و هەموو پێداویستییەکانمان لە بەردەستدایە، وەلێ دەڵێم ئێمە پێویستمان بەوانە. دەمەوێت بڵێم کاتێک یارمەتی کەسێک دەدەیت، لە ڕاستیدا یارمەتی خۆت دەدەیت. ڕەنگە سەیر دەرکەوێت و هەرگیز بیرت لەوە نەکردبێتەوە، وەلێ ئەوە ڕاستییە. دەمەوێت بە دوو شێواز ئەمەتان بۆ ڕوون بکەمەوە:

### یەکەم: لە ڕوانگەی دەروونناسیی عەلمانییەوە:

شەپۆلێکی نوێی دەروونناسی هەیە، پێی دەوترێت: «دەروونناسیی ئەرێنی». ئەم شەپۆلە نوێیە تیشک دەخاتە سەر ئەوەی؛ چۆن یارمەتی کەسانی دی بدەین؟ چۆن یارمەتیدانی کەسانی دی کاریگەری دەبێت لەسەر تەندروستی و بەختەوەرییمان؟ چۆن ژیانێکی باشتر بژین؟

چۆنیەتی زیادکردنی بەختەوەری:

بەختەوەری هەمیشە بەوە پێناسە کراوە ئەگەر چەند ئامانجێکی دیاریکراو وەکو خانوو، پیشەی باش، ئۆتۆمبیلی باش... هتد بەدەست بهێنم، ئەوا بەختەوەرم. توێژینەوەکان دەریانخستووە کە ئەوەی مرۆڤ ئامانجێتی لە خانوو و سەروەت و سامان، تەنها بەختەوەرییەکی کاتی بە خاوەنەکەی دەبەخشن. چەند ئاستێکی بەختەوەری هەیە بۆ مرۆڤ. کاتێک ڕووداوێک لە ژیانتدا ڕوودەدات، کە زۆر ئاواتەخوازی بوویت، ئەوکات بەختەوەرییەکی کاتی هەست پێ دەکەیت. کەواتە چی شتێک هەیە بتوانێت بەختەوەری هەمیشەیی لە ژیانی مرۆڤدا دروست بکات؟ یەکێک لە سەرەکیترین و گرنگترین ئەو شتانەی بە شێوەیەکی گشتی بەختەوەریت زیاد دەکەن، بریتییە لە خزمەتکردن و یارمەتیدان و بەخشین بە کەسانی دی. واتە کەسێکی بەخشندە بیت و هاوکاری کەسانی نەدار و پێویست بکەیت. بۆ نموونە کاری خۆبەخشی چارەسەرێکی زۆر باشە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەنجامی دەدەن. زۆر کەس پێت دەڵێت پارە نابێتە هۆی بەختەوەری. لە ڕاستیدا ئەم وتەیە ڕاست نییە. پارە دەبێتە هۆی بەختەوەری. بەڵێ، پارە دەبێتە مایەی بەختەوەری، کاتێک لە کەسانی دیدا خەرج دەکرێت و بەکار دەهێنرێت. توێژینەوەکان دەریانخستووە ئەوانەی پارەیان لە کەسانی دیدا خەرج کردووە لە ڕاستیدا بەختەوەر بوون، بەڵام بەختەوەر نەبوون کاتێک پارەکانیان لە خۆیاندا خەرج کردووە. ئایا شتێکی سەرنجڕاکێش نییە؟ کەواتە کاتێک من پارەم هەیە و لە خۆمدا خەرجی دەکەم، نابێتە هۆی بەختەوەری و زیادکردنی بەختەوەریم، بەڵام ئەگەر لە کەسانی نەدار و پێویستدا خەرجی بکەم، دەبێتە مایەی بەختەوەریم. تەنانەت بە کڕینی شتێک، یاخود خەڵاتێک بۆ کەسێک و بیرکردنەوە لەو ساتە، دەبێتە مایەی بەختەوەری و دڵخۆشیت.

شتێک لە ناخی مرۆڤدا هەیە کە فیترەتە و دیزاینێکی ئیلاهییە کاتێک بە کەسێک دەبەخشم، هەست بە ئاسوودەیی و بەختەوەری دەکەم. شتێکی قووڵتر و گرنگتر هەیە دەمەوێت باسی لێوە بکەم. تەنانەت دەروونناسیی عەلمانیش کاریگەرییە بەهێز و گەورەکەی یارمەتیدان و خزمەتکردن و بەخشین بە کەسانی دی خستۆتە ڕوو. واتا فیترەتی هاوکاریکردنی یەکتر لە ناخماندایە و پەروەردگاریش دەیەوێت مرۆڤەکان هاوکاری یەکتر بن و ڕاستەوخۆ پاداشتەکەیمان دەداتەوە، بێ ئەوەی چاوەڕێی ڕۆژی دوایی بین، کە بریتییە لە بەختەوەری و ئاسوودەیی ناخی مرۆڤ. ئەمەش بۆ هەموو کەسێک هاوشێوەیە، جا باوەڕداربێت، یاخود بێباوەڕ کاتێک هاوکاری کەسانی دی دەکات. مرۆڤ بەو چەشنە لە لایەن پەروەردگارەوە دروست کراوە. ئەوە تاکە ڕێگایە بۆ زیادکردنی بنچینەی بەختەوەریت. هیچ شتێکی دی ئەو چەشنە بەختەوەرییە ناخولقێنێت، جا بردنەوەی یانسیب بێت، یاخود بەرزبوونەوەی پلە و پۆست.

هەروەها توێژینەوەکان دەریانخستووە سوپاسگوزاربوونی بەردەوام بۆ ئەو شتانەی هەتە و نیتە، دەبێتە مایەی زیادبوونی بەختەوەری مرۆڤەکان. چارەسەرێکی باشی خەمۆکییە. سوپاسگوزاری بەردەوام چارەسەرێکی باش بووە بۆ ئەو نەخۆشانەی تووشی خەمۆکی هاتوون. هەروەها ئەگەر کەسێک لە گرفت و ناڕەحەتییەکی سەختدا بێت، بە یارمەتیدانی کەسانی دی کە لە گرفت و ناڕەحەتیدان هەست بە باشی و ئاسودەیی دەکەن. ئەمانە هەمووی هۆکاری دەروونین، کە ڕوونی دەکەنەوە چۆن خزمەتکردن و یارمەتیدانی کەسانی دی، بریتییە لە یارمەتیدانی خۆم پێش هەموو شتێک.

## دووەم: لە ڕوانگەی ئیسلامییەوە:

با بزانین قورئانی پیرۆز و فەرمایشتەکانی پەیامبەر موحەممەد(ﷺ) چۆن باس لە گرنگی و سوودەکانی خزمەتکردن و هاوکاری کەسانی دی دەکەن. لە ئایینی ئیسلامدا زۆر جەخت لەسەر یارمەتیدانی کەسانی دی و پاداشتەکەی کراوەتەوە. چۆن مامەڵە لەگەڵ دروستکراوەکانی دیدا بکەم، پەروەردگار بەو چەشنە مامەڵەم لەگەڵدا دەکاتەوە، جا مرۆڤ بێت، یاخود ئاژەڵ. گوێبیستی ئەوە بووین کە کەسێک پاداشت دراوەتەوە بەوەی لەگەڵ ئاژەڵاندا باش بووە، لە کاتێکدا کەسێکی دی سزا دراوە بەهۆی خراپبوونی بۆ ئاژەڵان. ئەمەش تێگەیشتنێکی قووڵ و فراوانە. کاتێک دەزانم چۆن مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکەم، پەروەردگاریش بەو چەشنە مامەڵەم لەگەڵدا دەکات، چاکبوونم بەرامبەر کەسانی دی لە ڕاستیدا چاکبوونە بەرامبەر خۆم، ئەمەش ئاستێکی بەرزترە. باس لەوە ناکەین کە خەڵکی پێت دەبەخشن، وەلێ باس لەوە دەکەین کە پەروەردگارت پێتی دەبەخشێت. کاتێک چاوەڕێی پاداشتی ئیلاهی دەبیت، چیدی چاوەڕێی ئەوە ناکەیت مرۆڤەکان پاداشتی چاکەکەت بدەنەوە، بۆ نموونە لە کۆمپانیایەکدا کار دەکەیت، تۆ هەڵسوکەوت و مامەڵە لەگەڵ کڕیاراندا دەکەیت، وەلێ ئەوە کڕیاران نین کە مووچەکەت دەدەنێ، کەواتە چۆن ڕەفتار لەگەڵ کڕیاراندا دەکەیت، تەنانەت ئەگەر ئەوان خراپیش بن؟ پێویستە هەمیشە بە باشترین شێوە ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەیت، نەک لەبەر ئەوەی کڕیاران مووچەکەت دەدەنێ، بەڵکوو لەبەر ئەوەی خاوەن و بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە مووچەت دەداتێ و بۆ ئەوەی لە کارەکەت دەرنەکرێیت. دەزانیت چۆن لەگەڵ کڕیاراندا ڕەفتار بکەیت کاریگەری دەبێت لەسەر پیشەکەت

و مووچەکەت. بەم چەشنەش پێویستە بە باشی ڕەفتار لەگەڵ دروستکراوەکاندا بکەین، چونکە پەروەردگار پاداشتمان دەداتەوە. چەنێک پارە بە کەسانی نەدار و هەژار ببەخشیت، لەو دونیادا بە چەندین قات پاداشتی وەردەگریتەوە. چەشنی وەبەرهێنان وایە. ئایا وەبەرهێنان مانای لەدەستدانی پارەیە؟ نەخێر، بەڵکوو زیادکردنی بڕی پارەکەیە. ئەگەر منداڵێکی پێنج ساڵان ٢٠ دۆلاری پێبێت و بڵێم پارەکەت بخەرە وەبەرهێنانەوە، هەست دەکات پارەکەی لە دەست دەدات، چونکە ئاستی تێگەیشتنی کەمە. هەندێکمان هەمان بیرکردنەوەی ئەو منداڵە پێنج ساڵانەمان هەیە، وا دەزانین ئەگەر پارەکەمان لەپێناو پەروەردگاردا خەرج بکەین، پارەکەمان لە دەست دەدەین. بۆیە بەخشینمان لە لا سەخت و دژوارە. کەس نایەوێت پارە لەدەست بدات. لە ڕاستیدا ئەوە بەکارهێنانی پارەکەمانە لە وەبەرهێناندا. کاتێک پەیامبەر(ﷺ) لە دەرەوە بوو و دایکە عائیشە مەڕێکی کردە خێر. پاشان پەیامبەر(ﷺ) گەڕایەوەماڵەوە و عائیشە پێی فەرموو، هەموو گۆشتەکەم بەخشییەوە، تەنها ئەو بەشەی نەبێت کە ئارەزووی دەکەیت. پەیامبەر(ﷺ) پێی فەرموو، لە ڕاستیدا تەنها ئەوانەمان پاراستووە کە بەخشیوتە و ئەو بەشەی نەتبەخشیوە لە دەستمان داوە.

ئایا کەس دەتوانێت پارەکەی لەگەڵ خۆیدا ببات بۆ نێو گۆڕ؟ دەزانم زۆرێکتان دەڵێن نەخێر، وەلێ وەڵامەکەتان هەڵەیە. دەتوانیت پارەکەت لەگەڵ خۆتدا ببەیتە نێو گۆڕەوە، ئەویش لە ڕێگای خەرجکردن و بەکارهێنانی لە خێرێکی نەبڕاوەدا (صدقة جارية).

# پێنج هەڵەی خێزانی



بە گشتی بڕوام وایە پێنج هەڵەی خێزانی هەن کە لە هەموو جیهاندا ئێمەی موسڵمان و ئومەتی ئیسلامی لە نێو خێزانەکانماندا ئەنجامیان دەدەین. هەڵە و کێشەکانمان چین؟ بەپێی ئاخاوتن و گفتوگۆکانم لەگەڵ خەڵکی لە سەرانسەری جیهاندا و تێبینیکردن و مامەڵەکانم لەگەڵ کۆمەڵگادا، ئەم چەند هەڵەیەم بەرچاو کەوتووە و بەپێی پلەی باوی و گرنگیان ئاماژەیان پێ دەدەین:

### یەکەم/ دانانی سەنتەر و ناوەندێکی هەڵە لەنێو خێزانەکانمان و پەیوەندییەکانماندا:

زۆرێک لە ئێمە کەسێک یاخود شتێکی دی جگە لە پەروەردگار دەکەینە سەنتەر و ناوەندی پەیوەندییەکانمان و خێزانەکانمان. تەنانەت ئێمەی موسڵمانانی پابەند بە ئایین هەمان هەڵە دووپات دەکەینەوە، هەڵەیەکی کوشندە و ترسناکە. هەرچەندە بە هەڵەیەکی بچووک و ورد و لاوەکی دەردەکەوێت، وەلێ گەلێک شێوێنەر و لەناوبەرە. زۆرجار ئێمە بەتایبەت دایکان منداڵەکانمان دەکەینە سەنتەر و ناوەندی ژیانمان. بە گشتی پێمان وتراوە بەو شێوازە دەتوانین ببینە دایکێکی باش و نموونەیی. ئێمەی دایکان زۆرجار

منداڵەکانمـان و بەتایبـەت کوڕەکانمـان دەکەینـە سـەنتەر و تەوافیـان بـەدەرودا دەکەیـن. واتـا چیـدی پـەروەردگار لـە ناوەنـد و سـەنتەری ژیانمانـدا نابێـت، ئەمـەش تـا ڕادەیـەک هەسـتپێنەکراو و بچـووک دەردەکەوێـت، چونکە کەسمان ناڵێین کوڕەکەمـان لەبری پـەروەردگار دەپەرسـتین. مانـای چییـە کاتێـک کەسـێک یاخـود شـتێکی دیکـە جگـە لـە پـەروەردگار دەکەینـە سـەنتەر و ناوەندی ژیانمـان؟ ئـەو هەڵەیـەی ئەنجامـی دەدەیـن بریتییـە لـە نەبوونـی هاوسـەنگی لـە پەروەردەکـردن و گەورەکردنـی منداڵەکانمـان. بەتایبـەت بەهـۆی ئـەو هەسـت و خۆشەویسـتییەی دایکان بـۆ منداڵەکانیـان هەیانـە، شـتێکی ئاسـایی و سـانایە کـە دایکان منداڵەکانیان بکەنـە سـەنتەر و ناوەندی ژیانیـان و تەوافیـان بـەدەوردا بکـەن. دایـکان هـان دەدرێـن بـەو چەشـنە ڕەفتـار بکـەن. کۆمەڵـگا و کولتـوور دەیسـەپێنێتە سـەر ئافرەتـان کـە تەنهـا لەپێنـاو منداڵەکانیـان بەتایبـەت کوڕەکانیـان بژیـن، بخـۆن، بخـەون و هەڵسـن. چـاوەڕوان دەکرێت هەمـوو شـتەکانی دیکە فەرامـۆش بکەن و وەلای بنێن. بـە چەشـنێک زۆرجار ڕۆڵ و ئەرکـی هاوسـەرێتی خۆیـان فەرامـۆش دەکـەن. ئـەو ئافرەتانـەی تـازە چوونەتـە نێـو پرۆسـەی هاوسـەرگیرییەوە، هاوسـەرەکانیان دەکەنـە سـەنتەری ژیـان و بوونیـان تاکـو ئـەو سـاتەی منداڵێـک دێتـە ژیانیانـەوە. پاشـان منداڵەکـە دەبێتـە سـەنتەری ژیانیـان و حـەق و مافـی هاوسـەرەکانیان لەیـاد دەکـەن. گرفـت و هەڵەکانـی ئـەم حاڵەتـە بریتییـن لـە:

١. پێویسـتە تەنهـا پـەروەردگار سـەنتەر و ناوەنـدی ژیانمـان بێـت. نابێت ژیانمـان وابەسـتە و دڵبەسـتی هیـچ کـەس و شـتێک بکەیـن، جگـە لـە زاتـی پـەروەردگار.

٢. کەسـێکی خۆپەرسـت و خۆویسـت پـەروەردە دەکەیـن. واتـا بـەو شـێوەیە منداڵێک پـەروەردە دەکەیـن کـە وا بیردەکاتـەوە و چـاوەڕوان

دەکات هەموو جیهان بە دەوریدا بخولێنەوە و خزمەتی بکەن، چونکە دایکی بەو چەشنە پەروەردەی کردووە. وابیردەکاتەوە خۆر تەنها لەپێناوی ئەودا و بۆ خاتری ئەو هەڵدێت. ئەمەش یەکێکە لە نەخۆشییەکانی دڵ و نەخۆشیی دەرونی و ڕۆحی تەشەنە پێ دەکات.
٣. چیدی سەرکردەیەکی بەهێز پەروەردە ناکەین کاتێک منداڵەکانمان فێری هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی ناکەین و هەموو شتێکیان بۆ ئەنجام دەدەین. تەنانەت ناتوانن جێی نوستنەکەی خۆیان ڕێکبخەن، چونکە سەرقاڵ و مژۆڵی یاری ڤیدۆیین. ئێمە بە هەڵە ئەو جۆرە پەروەردەکردنە ناودەبەین بە خۆشەویستی. هەموو کارێکیان بۆ دەکەین، چونکە خۆشمان دەوێن و بەو چەشنە خۆشەویستی خۆمان دەردەبڕین. ئەمە زیانیان پێ دەگەیەنێت، چونکە کەسێکی تێکشکاویان لێ دەردەچێت و فێری هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی نابن. ئەو منداڵە دەبوو گەورەبێت و ببێتە سەرکردە و پێشەوا. هەرگیز فێری هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی نەبووە، هەموو کارەکانی بۆ ئەنجام دراوە و تاکە بەرپرسیارێتی ئەو بریتی بووە لە بردنەوەی یارییە ڤیدۆییەکان. ئەمە کارەساتێکی گەورەیە کە ئێمەی دایکان و باوکان درک ناکەین بەوەی بەشدار و بەرپرسین لە خولقاندنی ئەم کارەساتەدا. بەم شێوەیە تەنها زیان بە منداڵەکانمان ناگەیەنین، بەڵکو کۆمەڵگاش تووشی گرفت و ئیفلیجی دەبێت، چونکە ئەم سەرکردانەی داهاتوو فێری هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی ناکەین تاکو ببنە کەسانی گەورە و پێگەیشتوو. دواتر گرفت و کارەساتی گەورەتر دروست دەکات. لە ئێستادا گرفت و قەیرانی هاوسەرگیری سەریهەڵداوە. چەندین ئافرەتی سەڵت و زگورت هەن ناتوانن هاوسەرێکی گونجاو و شیاو بدۆزنەوە، چونکە زۆرجار کوڕان نایانەوێت هاوسەرگیری بکەن، بەهۆی چەند هۆکارێکی جیاجیاوە. سەرەکیترین هۆکار بریتییە لەوەی کوڕانمان فێرنەکراون و ئامادەنەکراون بەرپرسیارێتی هەڵبگرن.

## دووەم/ بوونی بنچینە و بناغەی هەڵە لەنێو خێزانەکانماندا:

زۆرجار منداڵەکانمان دەکەینە بناغە و بنچینەی پێکهاتەی خێزانەکانمان. نابێت منداڵ بناغە و بنچینەی خێزان بێت، بەڵکو دەبێت هاوسەرێتی بێت. واتا پەیوەندی نێوان ژن و مێرد بریتی بێت لە وەبەرهێنان و لەپێشتر دابنرێت. ئەمە دەبێتە هۆی پتەوی و بەهێزی خێزان. بەداخەوە زۆرجار پەیوەندی نێوان ژن و مێرد دەبێتە شتێکی بێبایەخ و فەرامۆشکراو. تەنها بایەخ بەوە دەدەین بزانین منداڵەکانمان پێویستیان بە چییە تاکو بۆیان دابین بکەین. دوای تێپەڕینی چەند ساڵێک، پەیوەندی نێوان ژن و مێرد دەبێتە پەیوەندییەکی سادە و بۆ یەکتری دەبنە دوو کەسی نامۆ و غەریبە. تەنها ڕۆڵی دایک و باوکێک دەبینن لەژێر سەقفێکدا پێکەوە دەژین. پەیوەندییەکەیان چیدی وەبەرهێن نابێت. واتا چیدی نایانەوێت ساتێکی خۆش پێکەوە بەسەربەرن. لایان سەیر و نامۆ دەبێت جارێکی دیکە لە دەرەوە ژوان پێکەوە ببەستن. بە تاوانی دەزانن دایەنێک بۆ منداڵەکانیان دابنێن و ماوەیەک لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا بە تەنها بەسەربەرن. بووژاندنەوە و زیندووکردنەوەی پەیوەندی نێوان ژن و مێرد، شتێکی گرنگ و بایەخدارە لە پتەوکردنی پێکهاتەی خێزاندا. ئەگەر پەیوەندی نێوانتان بەهێز نەبوو، پێکهاتە و بناغەی خێزان بەهێز و پتەو نابێت، تەنانەت ئەگەر هەموو دونیا بۆ منداڵەکانتان موسەخەر بکەن.

## سێیەم/ سەرنجدان لە وێنە و دەرکەوتەکانی خۆمان و خەڵکی:

زۆرجار لە ژیانی ڕۆژانەماندا سەرنجی زۆر دەخەینە سەر ئەوەی خەڵکی چۆن بیرمان لێ دەکەنەوە، چ خانوویەکیان هەیە، چ جۆرە ئۆتۆمبێلێک لێدەخوڕن...هتد. ئەم شتە لاوەکیانە دەبنە خاڵی

بنـەڕەت و بنچینەیـی ژیانمـان. زۆر لـە خەمـی دونیـای منداڵەکانمانـدا دەبیـن وەکـو ئـەوەی بـۆ چ قوتابخانـە و کۆلێژێکیـان بنێریـن، ئاسـتی خوێندنیـان، نمـرە و بڕوانامەکانیـان. ڕاسـتە ئـەم شـتانە گرنگـن بـۆ ژیانیـان، وەلـێ زۆر زیادەڕەوی تێدا دەکەیـن، بـە چەشنێک بونیادنانی کەسـایەتییەکی چـاک و سـەلیم و ئاییـندار، بنیاتنانـی ناسـنامەی ئیسـلامییان فەرامـۆش دەکەیـن. تەرکیـزی تەواومـان لەسـەر ئەوەیـە منداڵەکانمـان بنێرینـە کۆلێژێکـی پزیشـکی.

گرفتێکی دیکـە بریتییـە لـە زۆر تونـدی و وشـکی وەکـو دەرخـەری ڕێـژەی ئاییـنداری. زۆرجـار هەندێـک کـەس زۆر ئاییـندار دەبـن، پاشـان تونـد و وشـک دەبـن، چونکـە وادەزانـن تاکـو ئاییندارتـر بیـت دەبێـت تونـد و وشـکتر بیـت. کـێ پڕیشـکی ئـەم تونـدی و وشـکییەی پـێ دەگات؟ بێگومـان خێزانەکـەی. واتـا دەبێـت ڕەق و تونـد بـم لەگـەڵ خێزانەکەمـدا، چونکـە ئاییـندارم. ئەمـە مانـای ئاییـنداری نییـە. پەیامبـەری نازدارمـان(ﷺ) دەفەرموێـت: «خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لأَهْلِهِ» واتـە: «باشـترینتان ئەوانـەن کە باشـترینن بۆ خێزان و هاوسـەرەکەی». بۆ ئـەوەی بزانیـت چەنـدە ئایینداریـت، سـەرنجی ڕەفتـار و هەڵسـوکەوتی خـۆت بـدە بەرامبـەر هاوسـەرەکەت و خێزانەکـەت. پەیامبـەری خۆشەویسـت(ﷺ) نەیفەرمـووە باشـترینتان ئەوانـەن کـە باشـترینە بەرامبـەر خەڵکـی مزگـەوت. کارێکـی ئاسـان و سـانایە ڕووخسـار و کەسـایەتییەکی دیکـە لەنێـو خەڵکیـدا بپۆشـیت و بەڕێـز و بەڕەوشـت بیـت لـە دووکانـی میوەفرۆشـیدا، بـەڵام قـورس و گرانـە ئـەوە لەگـەڵ خێزانەکەتـدا بکەیـت، چونکـە کەسـی دیکـە ئەمـە نابینێـت و لەنێو خەڵکیدا نییـە. هەروەهـا ئاسـان و سـادەیە فەرمـان بـە خێزانەکـەت بکەیـت، بۆیـە پەیامبەرمـان(ﷺ) دەفەرموێـت بنچینـەی ڕاسـتەقینە بریتییـە لـەوەی

لە پەنهانیدا بەرامبەر خێزانەکەت چۆنیت و باشترینتان ئەوانەن باشترینە بەرامبەر خێزان و هاوسەرەکەی، نەک باشترینە لەنێو خەڵکیدا. زۆرجار ئەم هەڵەیەمان هەیە بەرامبەر کەسانی دەرەوە و خەڵکی زۆر باشین و بەرامبەر خێزانەکانمان و هاوسەرەکانمان خراپین. بۆ نمونە، هەموو ڕق و تورەیی کار و بەڕێوەبەرەکەمان لە ناخماندا دەخۆینەوە و کاتێک دەگەڕێینەوە بە خێزانەکانمانی هەڵدەڕژین.

## چوارەم/ نەبوونی توانایەکی باش لە چارەسەرکردن و بەڕێوەبردنی کێشە و گرفتە خێزانیەکان:

تێبینیم کردووە خەڵکی لەکاتی گرفت و کێشەدا چاوەڕێ دەکات کێشەکە زۆر قووڵبێتەوە و تەشەنە بکات و ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕێت. پاشان داوای ڕاوێژ و یارمەتی دەکات بۆ چارەسەرکردنی. کاتێک گرفتێکی خێزانی یاخود هاوسەریمان دەبێت، چاوەڕێ دەکەین تاکو پەیوەندییە خێزانییەکە بمرێت، پاشان هەوڵی زیندووکردنەوەی دەدەین. ئەمەش گرفتێکی گەورەیە. وا دابنێ پزیشکێک هەیە و نەخۆشێکی لەبەردەستدایە، بەڵام ئەم پزیشکە چاوەڕێ دەکات تاکو نەخۆشەکە دەمرێت، پاشان دەست بە چارەسەرکردنی دەکات و هەوڵ دەدات زیندووی بکاتەوە. ئێمەیش زۆرجار بەم چەشنە ڕەفتار لەگەڵ هاوسەر و خێزانەکانماندا دەکەین. دەڵێین هیچ نییە، هەموو شتێک باشە. خەندەیەک دەکەین و هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکە نادەین، داوای یارمەتی و ڕاوێژ ناکەین تاکو کات زۆر درەنگ دەبێت. بەداخەوە کاتێک دێینەوە هۆش و داوای یارمەتی و ڕاوێژ دەکەین، کات زۆر درەنگ دەبێت و هیچ کاریگەرییەکی ئەرێنی

نابێت. لە سەرەتای سەرهەڵدانی کێشەکەدا هەوڵی چارەسەرکردنی نادەین. هەرکات گرفتێکی خێزانی سەری هەڵدا، پێویستە بە زووترین کات داوای یارمەتی بکەین و هەوڵی چارەسەرکردنی بدەین. نابێت بهێڵین کێشەکە هێندە گەورە ببێتەوە کە پەیوەندیەکەمان لەناوببات. یەکێکی دیکە لە گرفتەکان کە زۆر دووبارە دەبێتەوە بریتییە لەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر لە دۆخێکی خراپدا دەمێنینەوە. ئافرەتێک پەیوەندی پێوەکردم و وتی: «دوای تێپەڕینی چەند مانگێک بەسەر هاوسەرگیرییەکەماندا، بۆم دەرکەوت مێردەکەم خراپ و زۆردارە.» ئەی ئەم ئافرەتە چی کرد؟ زۆربەی کات کەسەکان دادەنیشن و دەمێننەوە، هیچ کارێک ناکەن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە. پاشان لە کۆتاییدا دووگیان دەبن. دواتر لەپێناو منداڵەکانیاندا دەمێننەوە. دوای بیست ساڵی دیکە، لەو دۆخە خراپە ڕزگاریان بووە دوای ئەوەی ئەم مێردەی نەک تەنها ئازاری ژنەکەی داوە، بەڵکو ئازاری هەموو منداڵەکانی داوە. ئێستا منداڵەکانی دەیانەوێت خۆیان بکوژن و نائومێد بوون. واتا لەسەرەتاوە بۆ ماوەیەکی زۆر دادەنیشن و هیچ هەنگاوێک بۆ چارەسەرکردنی نانێن، کاتێک درەنگ دەبێت هەوڵی چارەسەرکردنی دەدەن. ئەوە شتێکی خراپە. خوشکێکی دیکە نامەی بۆ ناردم و نووسیبووی مێردەکەم خراپە و ئەم کارە و ئەو کارەی کردووە. وەڵامم دایەوە و وتم هێشتا زووە و منداڵتان نییە، کارێکی زۆر باش دەکەیت ئەگەر زوو لەم دۆخە بێیتە دەرەوە، بەڵام بە گوێی نەکردم. دوای چەند مانگێک، نامەیەکی دیکەی ناردەوە، نووسرابوو ئێستا دووگیانم، ئایا دەتوانم منداڵەکەم لەباربەرم؟

بە گشتی سست و تەمەڵین و ئەمەش خراپە. پێویستە بە زووترین کات هەنگاو بنێین و لە کاتی پێویستدا کارێک بکەین.

## پێنجەم/ ئەگەر منداڵێکی چاکەکار و صاڵحت هەیە، سوپاسگوزاری پەروەردگار بە و ناشکور مەبە:

چاکەکاری منداڵەکەت بە فەزڵ و ئازایی خۆت مەزانە. مانای ئەوە نییە کە لە پەیامبەر نوح(ﷺ) باشتریت. کوڕەکەی پەیامبەر نوح(ﷺ) باوەڕ و ئیمانی نەهێنا و لە ڕیزی بێباوەڕاندا بوو. مانای ئەوە نییە پەیامبەر نوح(ﷺ) باوکێکی خراپ و ناشارەزا بووە. پەروەردگار بە شێوازی جیاجیا تاقیمان دەکاتەوە. خەڵات و بەخششەکانی بە چەشنێک دەبەخشێت کە خۆی بە گونجاو و شیاوی بزانێت. ئایا ڕۆڵ و ئەرکی ئێمەی دایکان و باوکان لێرەدا چییە ئەگەر هیچ شتێک لەدەسەڵاتماندا نەبێت؟

وەڵامی ئەم پرسیارە بەشێکە لە پەرستشەکەت. ئێمەی دایک و باوک بەرپرسیارین لە فێرکردنی منداڵەکانمان و نموونەیەکی باش بین بۆیان و هەموو هەوڵێکی خۆمان بدەین لە پەروەردەکردنیاندا. هەرچەندە ئەنجامی هەوڵەکانمان لە دەستی خۆماندا نییە و لە دەسەڵاتی پەروەردگاردایە. هیدایەت لە دەسەڵاتی من و تۆدا نییە، بەڵکو هەر پەروەردگارە هیدایەت دەدات. هەروەکو پەروەردگار لە سورەتی (القصص)دا بە پەیامبەرمان دەفەرموێت ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾ (القصص: ٥٦)

واتە: «تۆ ناتوانیت هیدایەتی ئەو کەسە بدەیت کە خۆشتدەوێت، بەڵام پەروەردگار هیدایەتی ئەو کەسە دەدات کە ویستی لەسەربێت». ئەمە شتێکی گرنگە کە لە خێزانەکانماندا لەبیرمان بێت. ئەگەر هاوسەرگیرییەکەت سەرکەوتوو بووە، پەروەردگار بەردەوامی بداتێ و بەرەکەتی تێ بکات. ئەگەر منداڵی سەرکەوتوو و چاکەکارت

هەیە، پەروەردگار ڕەحمتان پێ بکات. هەمیشە سوپاسگوزاری بۆ پەروەردگار دەربڕە و نەکەویتە هەڵەکەی قارونەوە کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد بە ئازایەتی و لێهاتوویی خۆی ئەو سەروەت و سامان و دەسەڵاتەی بنیات ناوە. مانای ئەوە نییە ئەگەر کەسێک هاوسەرگیرییەکەی سەرکەوتوو نەبوو، ئەو کەسە وەکو من زیرەک و لێهاتوو نەبووە. پێویستە واز لەم بڕیاردان و بەکەم تەماشاکردنی خەڵکە بێنین.

ته‌نـــیاحـــاجی

Tanya Haji | ته‌نیاحاجی

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چه‌ناڵێک تایبه‌ت به کتێب و  بابه‌تی جیاواز🤍

**ئه‌م کتێبه له‌لایه‌ن خاتوون " یوسڕا عمر "**

**کراوه به دیاری بۆ خوێنه‌ران**

چه‌ناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مه‌ینێره↓
@tanyahaji22

t.me/tanyahaji7



Yasmin Mogahed

ئەگەر تووشی دۆخێك، یاخود بڕیارێکی سەخت هاتیت، ئاگادار بە هەوڵ نەدەیت تەنها بە چاوی سەر شتەکە ببینیت. جووڵانەوە بەپێی ئەوەی لە جیهانی دەرەوەدا دەیبینیت گەورەترین فریودەرە و دەبێتە هۆی لەناوچوون و لاڕێیی.

چاوی سەرت دابخە و، داوا لە پەروەرێن بکە دڵت بجووڵێنێت و هۆشیاری بکاتەوە. تەنها بە چاوی دڵ دەتوانیت حەقیقەت و ڕاستییەکان ببینیت. تەنها بە چاوی دڵ دەتوانیت لەنێو ئەو خەیاڵاتانەوە ببینیت بەهۆی ئازار، خۆشی، یاخود ترسەوە بۆت دروست بوون.

تەنها بە چاوی دڵ دەتوانیت لەنێو دروستکراوەکان و دۆخە خوڵقێندراوەکانەوە ببینیت. تەنها بە چاوی دڵ پەروەرێن بەدی دەکەیت لە هەموو شتێکدا. بزانە و هۆشیاربە تەنها چاوی خاوێن و پاك دەتوانێت هەموو شتێك ببینێت.



07501269689
07511408868


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی تەوارێک، نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆل - دوکانی ژمارە (١١)





٦٠٠٠ دینار

ISBN: 978-9922-626-92-5


